خاوەنی ڕاستیو خۆگرتنو هێمنی بێو دارای ڕەوشتی مـــەردانەو ئینسانانە بێ ٠

**ئینسانی خۆشخوو ئەبێ بە هـــەتاو**
**ڕووناکی ئەدا بە عەرزو بە ئاو**
**ئینسانی بەدخوو ئاگرە بێ ئاو**
**حاشا لەو کەسە شەڕ دێنێتە ناو**
**ئوممەت ئەخلاقە کـــە ئەخلاق نەما**
**ئوممەتیش ئەڕوا بۆ فەوتو فەنا**

## نووری ئیمان بە حەشری گیانلەبەر

ئیمان بـــە حەشری گیانلەبەرانی (مکلف) ئەمەیە کە موسوڵمان باوەڕی ببێ لـــە پاش ئەوە خودای تەعلا هـــەموو (مکلف)ێ زینـــدوو ئەکاتەوە ، سەوق ئەکرێن بۆ مەحشەر ، خودای تەعالا فـــەرموویەتی ( وجاءت كل نفس معها سائق وشهيد لقد كنت في غفلة من هذا فكشفنـا عنك غطاءكَ فبصرك اليوم حديد ) واتـــە : هـــەموو نەفسێ دێ بۆ کۆمەڵـگای هوشیارانو لەگەڵیا هـــەیە دوو فریشتە ، یەکێ لە وانە وا بە دوایەوە وە ئەویشیان فریشتەیەکـــە شەهادەت لەسەر کردوەکانی ئەدا ، جـا پێی ئەوتری لـە لایەنی زاتی خوداوە : بە ڕاستی توغـافڵو بێئاگابووی لەم ڕۆژە ، وا پەردەمان لەسەر دڵو چاوت لا برد ، جـــا ئەمڕۆ چاوت تیژەو باش ئەبینێ ، هەر وەهـــا خودا فەرموویەتی ( يوم ندعو كل اناس بامامهم ) ڕۆژی حەشر ڕۆژێکە هەموو ئوممەتێ بە ناوی پێغەمبەرەکەیەوە بانگ ئەکەین ، جا یەکەم کەسێ ئەکەوێتە ڕێـــگە بۆ

مەحشەر -حەزرەتی موحەممەدە -صلی الله علیه وسلم- وە ئوممەتەکەی ئەکەونە شوێنی لەسەر ئیختیلافی پایەو مایەیان • وە ئادەمیزاد حەشـر ئەکرێن لەسەر ئەو حاڵە کە لەسەری مردوون لە دنیادا •

( عن جابر ــ رضی الله عنه ــ قال : سمعت النبي ــ صلی الله علیــه وسلم ــ یقول : یبعث کل عبد علی ما مات علیه من الأحوال • أي : فمن مات علی خیر یبعث علی حال حسنة ومن مات علی حالة سیئة بعث بحـال شنیعة ــ والعیاذ بالله تعالی ــ ) •

وە لەو ڕۆژەدا هەیبەتو ترس عالەم دائەگرێو ئەحواڵی خـەڵك چـەند جۆرەو زانستی ئەو حاڵانە وا لــە عیلمی خودادا ، بەڵام ئەهلی مەحشەر بە کورتی سێ بەشن : یەکەم (سابقین) واتە پێش کـەوتوان ، ئەوانەن کـە نزیـکی بارەگای خودان • دووەم ئەصحابی (میمنة) واتــە ئەوانە کـە دەفتەریان ئەدرێ بە دەستی ڕاستیانەوە ، یاخود خـاوەن (یمن)و حورمەتو پیرۆزین • وە ئەم بەشە هەم خاوەن پایەو حورمەتن • سێیەم ئەصحابی (مشأمة) واتە کە دەفتەری کردەوەیان ئەدرێ بە دەستی چەپیانەوە ، یاخود ئەوانە کـە خاوەن شومو بەدبەختن ، وە ئەم بەشـە عیبارەتە لـە هـەموو کافرانو تاوانباران ، وە ئەم سێ بەشە هــەموو ئوممەتی عالەم ئەگرێتەوە لە ئەووەڵی خەلقی (مکلف)انەوە تا ئاخــری دنیا دێو درێژەی حاڵی ئەمانە بەس وا لــە عیلمی زاتی خــودای تەعــالادا •

وە ئەو عەرزە کـە ئەهلی تەکلیف حەشر ئەکرێن لەســەری عەرزێـکی تازەیە ، خودا فەرموویەتی ( یوم تبدل الأرض غیر الأرض) بەم مەعنا ئەصڵی عەرزی پێشوو ئەمێنێ بەڵام صیفەتو حاڵی ئەگۆڕێ • وە کاتێ کە عالەم لەمــەوقیفی حەشردا ئەمێننەوە بیمو ترس داگیریان

ئەكاو لە خودا داوا ئەكەن دەست بكرێ بە حسێب كردن لەگەڵیانداو بەهیچ نەوعێ كەسیان دەست ناكەوێ تـكا بـكا ، وە بۆ لای هەر كەس ئەڕۆن لە پێغەمبەران عوزر دێننەوە ، تا ئەڕۆن بۆ خضووری پێغەمبەری ئاخر زەمان ( محمد المصطفی ) وە داوای تكای لێ ئەكەن بۆ ئەوە لـەو ئیستگای ناهەمواره دەرچن‌و دەست بـكرێ بە حسێب‌كردنیان ، ئەویش سوجدەی (تعظیم) ئەبا بۆ خودای تەعالاو داوای شەفاعەت ئەكا • جا لە جانبی خوداوە ئیزنی شەفاعەت‌كردنی ئەدرێ‌و دەس ئەكا بە شەفاعـەت بۆ ئەوە ئەو مەخلووقە لەو جێگە دەرچن وەیا حسێبیان لەگەڵدا بكرێ •

## نووري ئیمان بە شەفاعەت

شەفاعەت‌و تـكاكردنی حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ دەلیلی كیتاب‌و سوننەتی لەسـەرە ، ئەممـا دەلیل لـە قورئان ئەوە وەكو فەرموودەی خودا بـە حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ ( واستغفر لذنبك وللمؤمنین وللمؤمنات ) وە دیارە كە ئیستیغفار بۆ كەسێ عیبارەتە لە تـكاكردن بۆ عەفوكردنی ئەو كەسە • وە وەكو ئایەتی ( مـن ذا الذی یشفع عنده الا باذنه ) واته : كێیە ئەو كەسە كە تـكا ئەكا بۆ تاوانباران لە لای خودا مەگەر بە ئیزن‌و ئیجازەی خودا لەسـەر ئـەو تكاكردنە ، ئیستە ئەگەر تـكاكردن لەسەر ئیزن‌و ڕەزای خودا بۆ كەس ڕەوا نەبوایە ئەو (استثنا)یە بە بێ‌سوود دەر ئەچوو وە كـەلامی خودا دوورە لە كەلیمەی بێ‌سوود • وە وەكو ئایەتی ( ولا یشفعون الا لمن ارتضی وهم من خشیته مشفقون ) واته : تكاكارەكان تكا ناكەن بۆ كەس مەگـەر بۆ كەسێ كـە خودای تەعالا ڕازی بێ بە تـكاكردن بۆی ، وە ئەو تكاكارانە لـە ترسی خودا وان لە پارێزدا • وە لەم قەبیلە نصووصە

زۆرن‌و دیارن لە لای زاناکان • وە هەر ئایەتی مەنعی شەفاعەتی تێدا بێ ئەوە واریدە لە شەئنی کافرەکانداو بۆ موسوڵمان نیە •

وە دەلیلی شەفاعەت لە سوننەتی پێغەمبەردا ـ صلی الله علیه وسلم ـ گەلێکن :

یەکەم ئەوەی کە جابیر ڕیوایەتی کردووە کە حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : ( شفاعتي لأهل الكبائر من أمتي ) واتە تکاکردنی من لە حضووری خودادا بۆ ئەوانەیە کە خاوەن تاوانی گەورەن لە ئوممەتەکەم • ئەم حەدیثە ترمزیو ئەبو داوود ڕیوایەتیان کردووەو لە ئەحادیثی مەشهوورەیە • وە سرِی شەفاعەت یەکەم : دەرکەوتنی میهرەبانی خودایە بۆ بەندەکانی بە تاوان‌بەخشین • دووەم دەرخستنی پایەی تکاکارەکانە لە لای خودادا •

وە ئەو فەرموودەی حەزرەتە ـ صلی الله علیه وسلم ـ کە کاتی هاتنی ئایەتی ( وانذر عشيرتك الأقربين ) هاتە خوارەوە فەرمووی : ( یا بني عبدالمطلب أنقذوا أنفسكم من النار ، یا فاطمة انقذي نفسك من النار ، فاني لا أملك لكم شيئا من الله غير أن لكم رحماً سأبلها ببلالها ) واتە : من خاوەنی هیچ شتێ نیم بۆ ئێوە لە لایەنی خوداوە ، ئەوەندە هەیە خزمایەتی‌یەکە لە نێوماندا بەشی ئەو خزمایەتی‌یە هەوڵتان بۆ ئەدەم‌و ئەو خزمایەتی ئێوە چاودێری ئەکەم بە نمێ لە تەڕی حەولی خۆم‌و ڕەحمی خودا • ئەمە چەند جوابیان هەیە :

یەکەم مەبەستی ئەوەیە کە لە کافرێتی دەرچن و موسوڵمان بن ئەنا کافر سوود وەرناگرێ‌و ڕزگار نابێ لە قیامەتدا ، وە فاطیمەیشی بۆ ئەوە باس کرد بۆ ئیشارەی ئەوە حەتا ئەگەر خودا نەخواستە ئەویش

کافر بێ من سوودی پێ ناگەیێنم •

دووەم فەرموویەتی : ( لا أملك ) واتە مالیك نیم خۆی نەیفەرمووە تکا ناکەم ، عەلاوە بۆیە باسی تکای نەکرد هەتا ئەوان بە هۆی ئەو تکاوە پاڵ نەدەنەوە •

سێیەم عەینی حەدیثەکە ئەبێ بە دەلیلی شەفاعەت ؛ چونکی فەرمووی : ( غیر أن لکم رحما سأبلها ببلالها ) واتە : بەرانبەر بەو ڕەحمیەتو خزمایەتی‌یە هەوەڵ ئەدەمو نمێ سوود پەیدا ئەکەم ؛ چونکی مەعنای حەدیثەکە وایە ئەو خزمایەتی‌یە تەڕ ئەکەم بە تەڕی‌یەك شایاو بێ ، مەبەس ئەمەیە تا بتوانم سوودتان پێ ئەگەیەنم بە هۆی ئەوەوە • وە ثابیت بووە لەسەر ڕووناکی فەرموودەکانی حەزرەت ـ صلى الله عليه وسلم ـ کە بۆ حەزرەت ـ صلى الله عليه وسلم ـ پێنج شەفاعەت هەیە •

یەکەم شەفاعەتی ( عظمى ) واتە : تکای زۆر گەورە کە موسوڵمانو کافر دائەگرێ کە مەشهوورە ئەم تکایە بە ( مقام محمود ) ئەمەیش بریتی‌یە لە ڕزگارکردنی ئەهلی مەوقیف لە بیمو ترسی مانەوەیان لەو شوێنەدا •

لە صەحیحی بوخاریدا ڕیوایەت کراوە لە ( ابن عمر )ەوە ـ خوایان لێ ڕازی بێ ـ ئەڵێ : حەزرەت ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : ( مازال الرجل يسأل الناس حتى يأتي يوم القيامة ليس في وجهه مُزْعَةَ لحم • وقال : ان الشمس تدنو يوم القيامة حتى يبلغ العرقُ نصف الأذن، فبينما هم كذلك استغاثوا بآدم ثمّ بموسى ثم بمحمد ـ صلى الله عليه وسلم ـ فيشفع ليقضى بين الخلق فيمشي حتى يأخذ بحلقة الباب فيومئذ يبعثه الله

مقاما محمودا يحمده اهل الجمع كلهم ) ئەم حەدیثە شەریفە بوخاری لە کتێبی زەکاتدا ڕیوایەتی کردووە • تەماشای قەستەلانی بکەن هەروا موسلیم لە کتێبی زەکاتدا ڕیوایەتی کردووە ، وە تەماشای شەرحی ئیمامی نەوەوی بکەن لە شەرحی موسلیمدا •

بەم تکای یەکەمە کە مەشهوورە بە مەقامی مەحموود ئەهلی مەوقیف هەموو ڕزگار ئەبن لە مەوقیف‌و دەست ئەکرێ بە حسێب‌کردن لەگەڵیاندا •

شەفاعەتی دووەم تکایە بۆ دەرکردنی بازێ تاوانبارانی موسوڵمان لە ئاگری دۆزەخ • ( في صحيح البخاری في آخر الحديث الذي رواه في كتاب الرقاق قوله ــ صلى الله عليه وسلم ــ : فيأتون فاستأذن على ربّي فاذا رأيته وقعت له ساجدا فيدعني ما شاء الله ، ثم يقال لي : ارفع رأسك وسَلْ تُعطَه قل يُسمعْ واشفع تشفع ، فارفع رأسي فأحمَدُ ربّي بتحميد يُعلّمني ، ثم أشفع فيحدّ لي حدّاً ، ثم أخرجهم من النار وأدخلهم الجنة ، ثم أعود فأقع ساجدا لمثله في الثالثة أو الرابعة حتى ما يبقى في النار الاّ من حَبِسه القرآن • انتهى • وقال قتادة : أي : وجب عليه الخلود بنص القرآن ــ والعياذ بالله تعالى ــ ) •

سێیەم شەفاعەتە بۆ قەومێ کە موستەحەقی ئاگری دۆزەخن بە هۆی تاوانەکانیانەوە ، وە ناڕۆنە ئاگرەوە بە هۆی تکای حەزرەتەوە ــ صلى الله عليه وسلم ــ •

چوارەم شەفاعەتە بۆ قەومێ بۆ ئەوە داخڵی بەهەشت بن بە بێ حیساب • ڕیوایەت کراوە لە ئەبو ئەمامەوە ــ خودای لێ ڕازی بێ ــ ئەویش لە حەزرەتەوە ــ صلى الله عليه وسلم ــ ( قال : وعدني ربّي أن

يُدخل الجنّة من أمتي سبعين ألفا لا حسابَ عليهم ولا عـذابَ مـع كلٍ سبعون ألفا • رواه الترمذي بسند حسن • انظر : سنن الترمذي رقـم ٢٥٥٤ طبعة القاهرة ) •

پێنجەم شەفاعەتە لە زیادکردنی دەرەجەیە لە بەهەشتدا بۆ بازێ ئەهلی بەهـەشت •

وە لە پاش شەفاعەتی حەزرەتی موحەممەد ـ صلی الله علیـه وسلم ـ دەرگـای شەفاعەت ئەکرێتەوە بۆ هەر کەسێ خودا ڕازی بێ لە شەفاعەتکردن بۆی •

( وعن عثمان ـ رضي الله عنه ـ عن النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ قال : يشفع يوم القيامة ثلاثة الأنبياء ، ثم العلماء ، ثم الشهداء • رواه ابن ماجه بسند صحيح • وعن أبي سعيد الخدري ـ رضي الله عنه ـ ان رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ قال : من أمتي من يشفع للفئام ، ومنهم من يشفع للقبيلة ، ومنهم من يشفع للعصبة ، ومنهم من يشفع للرجـل حتى يدخلوا الجنة • رواه الترمذي • انظر الترمذي رقم الحديث ٢٥٥٧ • وعن ابي الدرداء ـ رضي الله عنه ـ عن النبي ـ صلى الله عليـه وسلم ـ قال : يشفع الشهيد في سبعين من أهـل بيته • رواه أبو داود • انظر : سنن ابى داود ـ كتاب الجهاد ٢/١٥ ) •

وە گەلێ ڕیوایەتی تر هەن بۆ ئیثباتی تکاکاری زانایانی دین و پیاو چاکانی ئوممەتی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ بۆ خزم و پەیرەوان و برادەران و باقی موسوڵمانان • وە سڕی هەموو ئەمـانە دەرخستنی میهرەبانی خودای تەعالایە لەبەر چاوی عالەمدا •

# نووري ئیمان به سوئال له ڕۆژی قیامه‌تدا

له نووری ئیسلامه ئیمان‌و باوه‌ڕ به پرسیارکردنی خودای ته‌عـــالا له به‌نده‌کانی خۆی له ڕۆژی قیامه‌تداو ده‌فته‌ری کرده‌وه‌یان پێ ئـه‌داو موحاسه‌به‌یان ئه‌کاو به‌ر له هه‌موو کـه‌س پرسیار له پێغـه‌مبه‌ران ئه‌کـا ـسه‌لامی خودایان له‌سه‌ر بێـ خودا فه‌رموویه‌تی : ( يوم يَجمعُ الله الرسلَ فيقول ماذا أجبتم قالوا لا علم لنا انك انت علاّم الغيوب ) واتــه : باسی ئه‌و ڕۆژه بـکه که خودای ته‌عالا پێغه‌مبه‌ره‌کان گرد ئه‌کـــاته‌وه‌و پرسیار ئه‌کا لێیان ، ئه‌ڵێ : چۆن وه‌ڵامتان درایه‌وه ئه‌وانیش له‌به‌ر شه‌رم له خودا یا له‌به‌ر ده‌هشه‌ت ئه‌ڵێن : خودایا ئێمه نازانین به‌ڕاستی تۆ خۆت زانای به هه‌موو شتێکی په‌نامه‌کی •

وه ڕیوایه‌ت کراوه له (عدي) کوڕی حاته‌مه‌وه ( قال رســول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ما منكم أحد الاّ سيكلمه الله ربّه يوم القيامــة ليس بينه وبينه تَرجَمان فيَنظر أيمَنَ منه فلا يرى الاّ ما قَدّم مــن عمله وينظر أشأم منه فلا يرى الاّ ما قدّم وينظر بين يديه فلا يرى الاّ النار تلقاء وجهه • فاتقوا النار ولو بشق تمرة • رواه الشيخان والترمذي • أخرجــه البخــارى في الرقاق ) •

واته : که‌س نیــه له ئێوه ئیللا خودا قسه‌ی له‌گه‌ڵدا ئه‌کـــا لـــه ڕۆژی قیامه‌تداو له ناوبه‌ینی خوداو ئه‌و که‌ســه‌دا ته‌رجومان نیه ، جـا کابرا ئه‌ڕوانێ بۆ لای ڕاستی خۆی‌و نابینێ ئیللا ئه‌و کرده‌وانه کـه له دنیـادا کردوویه‌تی ، وه ئه‌ڕوانێ بۆ لای چه‌پی هه‌م نابینێ ئیللا ئـــه‌و کرده‌وانه کـه لـه دنیادا کردوویه‌تی‌و ته‌ماشای به‌رده‌می ئه‌کاو نابینێ ئیللا ئاگر لـه به‌رانبه‌ریدا • ده‌ی مادام باشه ڕۆژی ئینسان وه‌هایه خۆتان

بپارێزن له ئاگر وەلەو بە لەتە خورمایەك • ئەم حەدیثە بوخاری و موسلیم و ترمزی ڕیوایەتیان کردووه • بوخاری له (كتاب الرقاق)دا نووسیویەتی •
( وعن أبي برزة الأسلمي ـ رضي الله عنه ـ عن النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ قال : لا تزول قدما عبد حتى يسأل عن عمره فيم أفناه وعن عمله فيم فعله ، وعن ماله من اين اكتسبه وفيم أنفقه ، وعن جسمه فيم ابلاه • رواه الترمذي • رقم الحديث ٢٥٣٢ طبعة القاهرة ) واتـــه : دوو پێی عەبدی خودا ناجوڵێن هەتا پرسیار نەکرێ له عومری که لـــه چیدا بڕاندوویەتەوه ، وه له کردەوەی کـه چی کردووه ، وه لـه مـــاڵ و دارایی‌یەکەی له کوێی پەیدای کردووەو له چیدا صەرفی کردووه ، وه له لەشی بەدەنی که له چیدا ماندووی کردووەو بڕاندوویەتی‌یەوه •

## نووري ئیمان به پەڕەی کردەوه

له نووری ئیسلامە ئیمان به وەرگرتنی پەڕەی کردەوەکانی ، خودا فەرموویەتی : ( فأمّا مَنْ أوتي كتابه بيمينه فسوف يحاسب حسابا يسيراً وينقلب الى أهله مَسرورا ، وأمّا مَن أوتي كتابه وراء ظهره فســـوف يدعوا ثبورا ويصلى سعيرا • سورة الانشقاق الآية ٩ـ١٢ ) واته : ئـەو کەســەی دەفتەری کردەوەی پێ بدرێ به دەستی ڕاستی‌یەوه ئـــەوه حسێبی لەگەڵدا ئەکرێ به حسێبێکی ئاسان و ئەگەڕێتەوه بۆلای ئەهـل و خزمانی موسوڵمانی به شادمانی • وه ئەو کەسەیش دەفتەری کردەوەی پێ بدرێ له پشتەوه تا ئەگا به دەستی چەپی ئەوه له مەولا واوەیلا ئەکاو ئەڕواتە ئاگری دۆزەخەوه •

ڕیوایەت کراوه له ئەنەسەوه ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ ئەڵێ : لـه

خزمەتی حەزرەتدا بووین تەماشامان کرد پێ ئەکەنی ، فەرمووی : ئەزانن بەچی پێ ئەکـــەنم ؟ وتمان : خوداو پێغەمبـــەری خـــودا ئەزانن • فەرمووی : لە وتاری بەندە لەگەڵ خودای خۆیدا ، ئەڵێ : یا ڕەببی ئایا پەنام نادەی لە ستەم تا کەس ستەمم لێ نەکـا ، ئەویش ئەڵێ : بەڵێ : ئەویش ئەڵێ : دەی مـــن ڕازی نابم بۆ ســـەر خـــۆم ئیللا بـــە شاهیـــدی لـــە لایـــەنی خۆمـــەوە بێ • خودایش ئەفەرموێت : ( كفى بنفسك اليوم عليك حسيبا ، وبالكرام الكاتبين شهودا ، قـــال : فيختم على فيه ، فيقال لأركانه : انطقي • قال : فتنطق باعماله ، قال ثـم يخلى بينه وبين الكلام ، فيقول : بعداً لكنّ وسحقا ، فعنكنّ كنت أناضل• أي : ادافـــع • رواه مسلم في كتاب الزهـــد • انظر : شرح النووي لصحيح مسلم ) •

## نووري ئیمان بە میزان

ئیمـــان بە میزان ئەمەیە ئینسانی موسوڵمان تەصدیق‌و باوەڕی ببێ بەوە کـــە لە ڕۆژی قیامەتدا خودا ئەمر ئەکـا بە کێشانەی بیروباوەڕو کردەوەی ئینسان لە چاکەو خراپە ، وە هەر چەند خودای تەعالا خۆی عالم‌و زانایە بە کـــەم‌و زۆری ئەوانە بەڵام ئەیەوێ لـــە بەر چـــاوی عالەمی دنیاداو لە ناو جن‌و ئینسدا چاک‌و خـــراپی ئەهلی تەکلیف دەر بکەوێ • وە چلۆنی ئەو میزانە حەواڵەی عیلمی خودایە • بەس ئێمـــە مەبەسمان لە میزان کارێـــکە ببێ بە هۆی زانستی چەندیەت‌و چلۆنی بیروباوەڕو کردەوەکان •

وە دلیل لەسەر ئەم وەزن‌و میزانە گەلێ ئایەتە لە قورئانی پیرۆز ، وەکو ئەو ئایەتە ئەفەرموێت لە سوورەتی ئەنبیائدا ( ونضع الموازين القسط

ليوم القيامة فلا تظلم نفس شيئا ، وان كان مثقال حبة من خردل اتينا بها وكفى بنا حاسبين ) واته : چەند میزانی عەداڵەت دائەنێین لە ڕۆژی قیامەتدا ، کە وابێ ستەم ناکرێ لە هیچ نەفسێ بە هیچ ئەندازەیێ کەم یا زۆر ، وە ئەگەر بە قورسی دانەی خەردەلێ بێ دەری ئەخەین و ئێمە کافین بۆ عالەم لە جیهەتی حیسابەوە •

وە دەلیل لە سوننەتی پێغەمبەردا ـ صلى الله عليه وسلم ـ زۆرن ( من جملە ) وەکو ئەوە ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ لە حەزرەتەوەـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرموێت: خودای تەعالا پیاوێ لە ئوممەتی من دێنێ بە ئاگاداری خەلائیقی قیامەت ( فينشر عليه تسعة وتسعين سجلا كل سجلّ مثل مد البصر ، ثم يقول الله : اتنكر من هذا شيئا ، اظلمتْك كتبتي الحافظون ؟ فيقول : لا يارب ، فيقول : بلى ان لك عندنا حسنة فانه لا ظلم عليك اليوم فتخرج بطاقة فيها : اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا عبده ورسوله • فيقول : احضر وزنك • فيقول : يارب ما هذه البطاقة مع هذه السجلات ؟ فقال : انك لا تظلم • قال فتوضع السجلات في كفة والبطاقة في كفة فطاشت السجلات وثقلت البطاقة فلا يثقل مع اسم الله شيء • رواه الترمذي • سنن الترمذي • رقم ٢٧٧٧ طبعة القاهرة ، واخرجه ابن ماجه في كتاب الزهد من سننه رقم الحديث ٤٣ ) •

## نووری ئیمان بە (قصاص) واتە تۆڵەوەرگرتن

ئیمان بە (قصاص) ئەمەیە موسوڵمان باوەڕی بێ کە خودای تەعالا حەققی ستەملێکراو ئەستێنێتەوە لە ستەمکار • وە دەلیلی ئەمە ئەوەیە :

( روي عن أبي هريرة ـ رضى الله عنه ـ أن رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ قال : من كانت عنده مظلمة لأخيه فليتحلله منها ، فانـه ليس ثمّ دينار ولا درهم ، من قبل ان يؤخذ من حسناته فان لم يـكن لـه حسنات أخذ من سيّآت اخيه فطرحت عليه • رواه الشيخان = البخارى ومسلم • وعن أبي سعيد ـ رضى الله عنه ـ عن النبيّ ـ صلى الله عليـه وسلم ـ قال : يخلص المؤمنون من النار فيحبسون على قنطرة بين الجنـة والنار فيقتص لبعضهم عن بعض مظالم كـانت بينهم في الدنيا حتى اذا هُذّبوا ونُقّوا أُذِنَ لهم في دخول الجنة ، فوالذي نفس محمد بيده لأحـدهم أهدى بمنزله في الجنة منه بمنزله الذى كان في الدنيا • رواه البخارى في الرقـــاق ) •

ئەم حەدیثە پیرۆزانە ڕیوایەت کران لە بابەتی هۆشیارانی جنن‌و ئینس بوون ، هەر چەند عەدالەتی خودا عامە بۆ هـەموو مەخلووقی ، هەر چەند لە حەیوانات بێ • حـەزرەت ـ صلى الله عليـه وسلم ـ فەرموویەتی : لَتُؤَدّنّ الحقوق حتى يقاد للشّاة الجلحاء مـن الشاة القرناء • أخرجه مسلم في كتاب البر ) •

وە ئەبێ بە دەلیل لەسەر ئەم تۆڵە سەندنەوە فەرموودەی خـودای تەعالا : ( وما من دابة في الأرض ولا طائر يطير بجناحيه الا امم امثالكم ما فرّطنا في الكتاب من شيء ) ئایەتی/٣٨ لە سوورەتی ئەنعام •

بەڵێ دەلیل نیە لەسەر لەززەت‌و عەزابیان لە بەهەشت‌و دۆزەخدا • وا دەر ئەکەوێ کە لە پاش حـەق لێ‌سەندنەوە‌کە مەحوو بنەوە • ( والله اعلم ) •

# نووري ئيمان به (صراط)

ئيمان به صيراط ئەمەيە موسولمان باوەڕى بێ بەمە كـــە پردێ ڕائەكێشرێ بەسەر ئاگرى دۆزەخدا • ڕيوايەت كراوە لە ( أبو هريرة ـ رضى الله عنه ـ عن النبيّ ـ صلى الله عليه وسلم ـ : ثم يضـــرب الصراط بين ظهرانى جهنم فاكون اول مـــن يجوز من الرسل بامتـــه ، ولا يتكلم أحد يومئذ الاّ الرسل وكلام الرسل يومئذ : اللهم سلّم سلّم • رواه الشيخان ) •

واتە : پاش ميزانى ئەعمال پردێ دروست ئەكرێ لەسەر پشتى دۆزەخ ، جـا من ئەووەڵ كەسێكم لە پێغەمبەران كـە ڕابوورێ لەگەڵ ئوممەتەكەيدا بەسەر ئەو پردەدا • وە لەو ڕۆژەدا كەس قسە ناكـــا ئيللا پێغەمبەران • وە كەلامى پێغەمبەرانيش لەو ڕۆژەدا ئەوەيە ئەڵێن : خودايا سەلامەتمان بـكە سەلامەتمان بـكە •

( وروى مسلم في الايمان عن أبي هريرة ، وعن حذيفة ـ رضي الله عنهما ـ أنه ترسل الأمانة والرحم فتقومان جنبتي الصراط يمينا وشـــمالا فيمرّ أولـكم كالبرق • قال : قلت بأبي أنت وأمي أي شيء كمر البرق ؟ قال : الم تروا الى البرق كيف يمرّ ويرجـع في طرفـــة عين ، ثم كمر الريح ، ثم كمر الطير وشد الرجال تجرى بهم أعمالهم ونبيكم قائم على الصراط يقول : ربّ سلّم سلّم حتى تعجز اعمال العباد ، حتى يجيء الرجل فلا يستطيع السير الاّ زحفا ، قال : وفي حافتي الصراط كلاليب معلقة مأمورة بأخذ من أمرت به فمخدوشٌ ناجٍ ومـــكدوس في النار ، والذي نفس ابي هريرة بيده أن قعر جهنم لسبعون خريفا • هذا جزء من حديث طويل رواه مسلم في كتاب الايمان •

وە ئەوەی لە فەرموودەکەی حەرزەتدایە کـە ئەمانەت و ڕەحم ڕاست و چەپی پردی صیراط ئەگرن ، مەعناکەی لەسەر بەیانی زانایانی دین ئەمەیە کـە خودای تەعالا دوو مەلائیکە دروست ئەکا بۆ خزمەتی ئەو موسولمانانە کە لە دنیادا هێمن و بێ خیانەت بوون و لەگـەڵ خزم و خوێشەکانیاندا میهرەبان بوون بۆ خەلاص بوونیان لەو شوێنەدا •

بە کورتی پردی صیراط ئەکێشرێ بەسەر دەرگای دۆزەخـداو هەر کەس ئەهلی دۆزەخ بێ دائەکـەوێ و ئەخرێتە دۆزەخەوەو بـە گوێرەی خۆی عەزاب ئەدرێ ، ئەگـەر کـافرە هەتا هەتایەو ئەگـەر موسولمانە بە قەدەر ئەو مـاوە بۆی دانراوەو پاش ئەوە ئەیهێننەوە بۆ بەهەشت ، وەکو زیندانی کراوێ کە ماوەی حەبسەکەی تەواو بێ • وە ئەوانەیش کـە موستەحەقی بەهەشتن ڕائەبوورن بەسـەریدا بـەرەو بەهەشت ، بازێ وەکو بەرق ، بازێ کەمتر و بازێ کەمتر • وە ئـەوەی کـە بەیان کراوە ئەو پردە : لـە موو باریکتر و لە ئەلماس تیژترە • ڕاستە بەلام ئینسانێ کە وەکو بەرق ڕابوری پێویستی بە ڕێگەی پـان و پۆڕ نیـە ، وە ئەوەیش کە بۆ دۆزەخ دانراوە بەڕاستی ناتوانێ ڕابوری و ئەکەوێتە ناو دۆزەخەوە • وە بۆ ئەوە وای لێکراوە •

دێتـە بیرم لـە سالی نۆصەدو سی و ئەوەندەدا لـە مەجلیسێکدا بووین ، ئەم مەوزوعە هاتە ناو ، خودا لێ خۆش بوو حاجی مەلا خالیدی موفتی فەرمووی : ئەم خەلـکە کە (تعجب) ئەکەن لەم پردە وا باشـە بڕۆن پردەکەی خواری قەزای (پردێ) ببینن ، لەوێدا مەکینە لە هـەر دوو لای ڕووبارەکەوە دامەزراوە ، وە لەسەر ڕووبارەکـەوە سیمێ بەسەر دوو عەموودا ڕاکێشراوەو بە هێزی مەکینەکە لۆری پڕ لە ئاسن بەرز ئەکرێتـەوەو بەسەر ئەو سیمە باریکەدا ئـەبرێ بۆ ئەو بەری

ڕووبارەکەوەو دایئەگرنە خوارەوەو بەکاریان دێنن •

وە ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت ( وان منکم الا واردها ) مەعنای ئەوەیە کە هەموو بەسەر پردی صیراطداو بەسەر دۆزەخدا ڕائەبوورن ، بەڵام ئەوانە کە ئەهلی تەقواو پارێزن داناکەون و خودا ڕزگاریان ئەکا ، وە ئەوانەیش کە ئەهلی دۆزەخن دائەکەون ، ئیتر مەعنای ئەوە نیە کە هەموو کەسێ ئەڕواتە ناو دۆزەخەوە جیا موسوڵمانەکان دێنە دەرەوە •

وە بازێ وتوویانە لەسەر ظاهیری ئایەتەکە هەموو کەس ئەڕواتە ناو دۆزەخەوە بەڵام ناڕۆنە دۆزەخەوە بۆ عەزابدان ، مومکینە لە پێش عبووری صیراطدا هەموو کەسێ وەکو ( استعراض ) بڕواتە ناو حدوودی دۆزەخەوە بەڵام ئەهلی عەزاب دووبارە کە هاتن بڕۆن بەسەر پردی صیراطدا دائەکەون و ئەهلی ئیمان داناکەون و ڕائەبوورن بۆ جیهەتی بەهەشت ( والحمد لله علی ذلك ) •

## خۆلاصەی باس

دەرکەوت لەو ئایەت و حەدیثانەوە کە نووسیمان ئەمە کە هەموو جن و ئینس حازر ئەکرێن لە حضووری خودادا لە ڕۆژی قیامەتدا لە مەحشەردا وەکو خودا فەرموویەتی : ( یومئذ تعرضون لا تخفی منکم خافیة ) • ئایەتی هەژدە لە سوورەتی (الحاقة)دا •

وە مەوقیفی مەحشەر زۆر جێگەی ترس و لەرزە • وە ئەدێنێتەوە هەتاکو حەزرەتی موحەممەد ـ صلی الله علیه وسلم ـ تکا ئەکا بۆ هەموو عالەم ، جا ئەبرێن بۆ میزان و کێشانی بیروباوەڕو کردەوە • وە

عالەم زۆر پەرێشانەو بێدەنــگە ، وەکو خودا فەرموویەتی : ( وخشعت الاصوات للرحمن فلا تسمع الا همساً ) ئایەتی / ١٠٨ لــە ســوورەتی (طه)دا ، وە فەرموویەتی : ( وعنت الوجوه للحي القيوم وقد خاب مـــن حمل ظلما ) ئایەتی / ١١١ لە سوورەتی (طه)دا ٠

جا پاش پرسیاری خودا لە عالەمو پاش میزانو کێشانەی ئەعمالو حسێبی هەموو خاوەن تەکلیف پردی صیراط ڕائەکێشرێ بەســـەر دەرگای دۆزەخداو عالـــەم بـــە ئەمری خودا بەسەریدا ئەڕۆن ، بەڵام دۆزەخی‌یەکان دائەکەون بۆ دۆزەخو ئەهلی بەهەشت ڕائەبوورن بەرەو بەهەشتو لەسەر ئاوی ( حوض المورود ) کە حەوزی تایبەتی حەزرەتە ـ صلى الله عليه وسلم ـ گرد ئەبنەوەو لە پاشا ئەڕۆن بە ئەمری خــودا داخڵی بەهەشت ئەبن ، هەر کەس بۆ شوێنی خۆی (والحمد لله) ٠

# نووري ئیمان بە ( حوض المورود )

ئیمان بە ( حوض المورود ) باوەڕە بەوە کە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ خەڵات کراوە لــە لایەنی خودای میهرەبانەوە بەوە کـــە حەوزێکی بێدراوە میزانی گەورەیی‌و پیاڵەی ئاو لێوەرگرتنی وا لـــە عیلمی خوداداو هەموو موسوڵمانێ لە جنو ئینس ئاوی لێ ئەخواتەوەو هــەر کــەس ئاوی لێ بخواتەوە ئیتر قــەت تینووی نابێو هەرکاتێ لە بەهەشتدا ئاو بخواتەوە یا هەر شەربەتێ ئەوە بۆ لــەزەتو ڕابواردنــە ، بۆ چـــاری تینوێتی نیـــە ٠

شێخی بوخاری ڕیوایەت ئەکا لە کتابی ( رقاق )دا کــە حەزرەت ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : ( حوضي مسيرة شهر مـــاؤه

ابیض مـــن اللبن وریحه اطیب مـــن المسك وکیزانه کنجوم السماء ، ومن شرب منه فلا یظمأ ابدا ) •

وه ئاوی ئەم ( حوض المورود )ە لە نەهری کەوثەرەوە دێت کـە وا لـە بەهەشتدا • وە بە حەدیثی شەریف ئەمە ثابت بووە •

## نووري ئیمان بە بەهەشتو جەهەننم

لـە نووری ئیسلامە ئیمان بە وجوودی دۆزەخ کـــە مـــاوای عەزابو ئازاری ئەهلی عەزابە ، وە بە وجوودی بەهەشت کـــە ماوای ئەهلی ڕەحمەتو طاعەتە • وە ئەم دوو ماوایە هەر دوویان مـــاوای ئەبەدی هەتا هەتان ـ خودا لە دۆزەخ بمان پارێزێو لە بەهەشتدا مارمان بداتێ بە رەحمی خۆی ـ •

بیرو باوەڕی موسوڵمان ئەمەیە کە بەهەشتو جەهەننم ئیستە هەنو خودای تەعالا دروستی کردوونو ئامادەی کردوون بۆ ئەو کەسانە ئەبن بە ماوایان ، بـــە دەلیلی گەلێ ئایەتی قورئانی پیرۆز ، وەکـو ئایەتی : ( وسارعوا الی مغفرة من ربّکم وجنة عرضها السموات والأرض أعدّت للمتقین ) ئایەتی ١٣٣ لە سوورەتی ئالی عیمران • واتە : ئەی هۆشیاران پەلە پەل بـکەن بۆ لای عەفوتان لە لایەنی خوداوەو بۆ لای بەهەشتێ کـە ماوەی بە قـەدەر پانایی عەرزو ئاسمانەکانە ، ئامادە کراوە بۆ ئەهلی تەقواو پارێزگاری • وە ئایەتی : ( واتّقوا النار التي اعدّت للـکافرین ) ئایەتی / ١٣١ لە سوورەتی ئالی عیمران • واتە : خۆتان بپارێزن لـــە عەزابی ئاگرێکی وەها کە ئامادە کراوە بۆ کافرەکان •

وە ئەمما شوێنەکەیان ئەوە هەر چەند دەلیلی نەصص نیـــە بۆ

دیاری کردنی ، بەڵام زۆربەی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەن کە جێگەی بەهەشت لە ژووری هەر حەوت ئاسمانەکانەوەیەو لە ژێر عەرشـــدایە ، لەبەر ظاهیری ئایەتی ( ولقد رآه نزلة أخرى عند سدرة المنتهى عندهـــا جنة المأوى ) واتە : حەزرەت ـ صلى الله عليـــه وسلم ـ جارێـــکی تر جوبرەئیلی بینیوە لە لای داری ( سدرة المنتهى )دا کـــە لـــە لای ئەو دارەدایە ( جنة المأوى ) •

وە چـەند ئەحادیث هەن دەلالەت ئەکەن لەسەر ئەوە کە بەهەشت لە ئاسماندایەو ( فردوس ) لە دەرەجە زۆر بەرزەکانە ، وە ڕیوایـەت کراوە حەزرەت فەرموویەتی ( سقف الجنة عرش الرحمن ) جـا بە دەلیلی ئایەتەکە بەهەشت گوشادە بە قەدەر هەموو ئاسمانەکانو عەرز ، وە سەقفی بەهەشت عەرش بێ مەعنای وایە بەهەشت وا لـــە ژووری هەموو ئاسمانەکانەوەو لە ژێر عەرشداو دۆزەخیش لە شوێنێ بێ کـــە عەلاقەی بە بەهەشتەوە بێ بە دەلیلی گفتوگۆی ئەهلی دۆزەخ لەگـەڵ ئەهلی بەهەشتدا بە نەصصی ئایەت لە سوورەتی ئەعرافدا •

وە ئەو کەسانە کـە زانان بە ئەحواڵی کائینات باوەڕیان وایە کـە فەضای عالەم وا لە ژوور (تصورات)ی ئێمەوە ، وە ڕێگەی گەلێ عالەمی ڕاستی تێدا هەیە ؟ چونـکە مادام بە کەشفی عیلمی ثابت بووە کە ڕۆژ ملوێنێ جـار بە قـەدەر عەرزەو ئەستێرەی ( شعرى ) ملوێنێ جار لـە ڕۆژ گەورەترەو لەبەر دووری بە بچووك دەر ئەکەوێ ئەبێ مـــاوەی کائینات گەلێ لە خەیاڵی ئێمە زیاترو گوشادتر بێ •

وە ئەم دوو شوێنە مەوجوودن هەتا هەتایەو ئەوانەیش وان لـــە ناویاندا هەروا ئەمێننەوە هەتا هەتایەو خیلافی ئەم بیروباوەڕە بێ دەلیلەو لەسـەر خـەیاڵو هـەوایە •

وه ئەمما صیفەتی دۆزەخو بەهەشتو ئەهلەکەیان ئەوە لە شەتنی ئەهلی دۆزەخدا بوخـــاریو موسلیمو ترمـــزی ڕیوایـــەت ئەکـەن حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : ( انّ أهونَ أهلَ النار عذابا یوم القیامة لرجلٌ توضع في أخمص قدمیه جمرتان یغلی منهما دماغه) واته : ئەهوەنترو سووکترینی ئەهلی دۆزەخ پیاوێـکه دوو پشکۆ ئاگر ئەخرێته ژێر پاژنەی پێکانی که دەماغی لە گەرمی ئەوانه ئەکولێ • وه ئەهلی دۆزەخ ئەوەی کـــافر بێ هـــەتا هەتایەو ئەوەی کـه موسوڵمان بێ دوای ماوەی عەزاب دێتەوە بۆ بەهەشت •

وه ئەمما بەهەشت ئەوە کـــافییه بۆ ستایشی ئەو وەکو خـــودا فەرموویەتی : ( فیها ما تشتهیه الأنفس وتلذّ الأعین وانتم فیها خـــالدون ) یەکێ قورئانی پیرۆز بخوێنێتەوە ئەزانێ نیعمەتی بەهەشت چەند زۆره • وه نەهری (کوثر) لە بەهەشتدایەو جۆگەی هەنگوینو شیری تێـــدایەو حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : ( قال عزوجل أعـددت لعبادي الصالحین ما لا عینٌ رأت ولا أذن سمعت ولا خطر علی قلب بشر ذخرا بَـلْـهَ ما اطلعکم الله علیه ) جا خوێندیەوە : ( فلا تعلم نفس ما اخفي لهم من قرة اعین جزاء بما کانوا یعملون • رواه الشیخـــان والترمـــذي ) •

## نووري چاو پێکەوتنی خودای تەعالا لە قیامەتدا

پێویسته هەموو موسوڵمانێ ئیمانو باوەڕی بێ که لە قیامەتدا بـه حضووری زاتی خودا ئەگاو چاوی پێئەکەوێ بە دەلیلی فەرموودەی خودا لە قورئاندا : ( وجوه یومئذ ناضرة الی ربّها ناظرة ) واته : چەند

ڕوونی لە ڕۆژی قیامەتدا جوانن‌و بۆ خودای خۆیان ئەڕوانن‌ەوە بە دەلیلی فەرموودەی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ کە فەرموویەتی : ( انكم سترون ربّكم كما ترون القمر ليلة البدر ) وە لە ریوایەتێکی تردا لـــە جەریری کوڕی عەبدوڵلاوە : ( قال : كنا عنـد رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ جلوساً ننظر الى القمر ليلة البدر • فقال : انـكم سترون ربّكم عيانا كما ترون هذا القمر لا تضامون في رؤيته ، فان استطعتم ان لا تغلبوا على صلاة قبل طلوع الشمس وقبل غروبها فافعلوا • ثم قرأ : وسبّح بحمد ربّك قبل طلوع الشمس وقبل الغروب • متفق عليـه ) واتە : لـە خزمەتی حەزرەتدا دانیشتبوین ئەمان ڕوانی بۆ مانگ لـــە شەوی چواردەدا ، لە وێدا حەزرەت فەرمووی : بێ‌گومان ئێوە لـــە مەولا خودای خۆتان بە ئاشکرا ئەبینن ـ واتە بە چاو ـ وەکو ئەم مانگە ئەبینن‌و دوودڵی ناکـەن لە چاو پێ‌کەوتنیدا ، جا ئەگەر ئەتوانن کـــە کۆڵنەدەن لەسەر کردنی نوێژێ لـە پێش دەرچوونی ڕۆژداو نوێژێ لـە پێش ئاوا بوونی ڕۆژدا دەی بـــکەن • جا خوێندی‌یەوە ئایەتی ( وسبّح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل الغروب )وە ئەم حەدیثـە بوخاری‌و موسلیم هەر دوویان ڕیوایەتیان کردووە •

وە بازە ئایەتێ کە مەنعی چاو پێ‌کەوتنی خودای تەعالا ئەکا ئەوە یا مەبەس چاو پێ‌کەوتنیەتی لە دنیادا وە یا لەسەر کافرەکـان تەطبیق ئەکرێ ، وەکو ئایەتی : ( كلا انهم عن ربهم يومئذ لمحجوبون ) واتـە : ئەو کافرانە لە خودای خۆیان مەحجووب‌و مەستوورن‌و بە حضـووری خودا ناگەن ؛ چونـکی ئایەتی چاو پێ‌کەوتنی خودا بۆ موسوڵمـــانان ظاهیرەو ئاشکرایەو حەدیثەکەیش تەواو ڕووناکی ئەکاتەوە •

وە بازێ لـە ئەهلی تەفسیری قورئانی پیرۆز تەفسیری لـــەفظی

(زیاده) له ئایەتی : ( للذین احسنوا الحسنی وزیادة ) به چاو پێ‌کەتنی خودای تەعالا ئەکەنەوه ، واته : بۆ ئەو کەسانه که چاکەیان کردووه جەزاو پاداشی چاك هەیه لەگەڵ زیادەیەکدا که بریتی‌یه له دیتنی خودای تەعالا • جا له کەرەمی زاتی خودای تەعالا داوا ئەکەین که زاتی خۆی نیشان بدا پێمانو به چاو پێ‌کەوتنی دلشاد ببین •

ئەم شــەش ئەرکانه وتمان بۆ ئیمان
بناغــەی دینن له بۆ موسوڵمان
هەتا باوەڕت به حــەق ئەستووره
دڵت بەڕاستی سەرچاوەی نووره
ئەزانی چلۆن هەنـگاو هەڵبێنی
یاســای ئیسلامی باش بەجێ بێنی
ڕۆح بۆ ژیانەو ئیمان بۆ دڵه
ئیمان کارەبای ماڵو مەنزڵه
کــه ئیمانت بوو به خودای عەللام
باش بەجێی دێنی کردەوەی ئیسلام
نامی لــه خودا ئەپارێتەوه
دڵتان به ئیمــان بحەسێتەوه

## نووري ئیسلام (ان الدین عند الله الاسلام)

( قال ـ صلی الله علیه وسلم ـ الاسلام ان تشهد ان لا اله الا الله وان محمدا رسول الله ، وتقیم الصلاة وتؤتي الزکاة وتصوم رمضان وتحج البیت ان استطعت الیه سبیلا ) •

واته : ئیسلام ئەمەیە کە بە دڵ باوەڕت بێ‌و بە زمان ئیقرار بکەی‌و وبلێی : ( لا اله الا الله ، ومحمد رسول الله ) بلێی : هیچ کەسێ لـە جیهاندا عیبادەتی بۆ ناکرێ بە ڕاستی‌و شیاوی عیبادەت بۆ کردن نیـــە ئیللا ئەو زاتە پەروەردگارە کـــە ناوی (الله)یەو موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی (عبـدالمطلب) کوڕی هـــاشم کوڕی (عبدالمنـــاف) پێغەمبەری خودایەو ڕەوانە کراوە بۆ تەمێ کردنی جنـــن‌و ئینس • وە نوێژ بە بەجێ بێنی کـــە بریتی‌یە لە پێنج فەرز لە هـــەموو شـــەوو ڕۆژێکدا • نوێژی صوبح دوو ڕکات • نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکـات • نوێژی عەصر چوار ڕکات • نوێژی مەغریب سێ ڕکات‌و نوێژی عیشا چوار ڕکات • لەسەر ئەو یاسایە کە لە دیندا بەیان کراوە • وە نوێژی جومعـــە دوو ڕکات • وە غەیری ئەم نوێژانە سوننەتن ( مؤکدة وغیر مؤکدة ) هەموو لە خەیراتن • وە زەکاتی دارایی خۆت بدەی بە وانـە کە شایاون بۆ ئەم پێدانە ، لەسەر ئەو یاسا لە دینی ئیسلامدا هەیە • وە مانـگی ڕەمەزان لە هەموو ساڵێکدا بە ڕۆژوویی لەسەر ئوصوڵی دین • وە حەج بـکەی ، واتە بڕۆی بۆ زیارەتی ماڵی خودا = کابەی پیرۆز ، لە شاری مەککەدا بە مەرجێ بتوانی بڕوی بۆ ئەو سەفەرەو بێتـەوە ، بەو یاسا کە لە دیندا دامەزراوە • وە دەرکەوت کە ئیسلامیەت پێنج ڕوکنی هـــەیە :

دوو شەهادەتە : أشهد أن لا اله الا الله ، وأشهد أن محمـــــدا رسول الله • وە پێنج فەرزەی نوێژ لە هەموو شـــەوو ڕۆژێکدا • وە ڕۆژووی مانـگی ڕەمەزان لە هەموو ساڵێکدا • وە زەکات‌دان بە خاوەن بەش • وە حەج کردن ، واتە زیارەتی ( کعبة الله ) لـــە شـــاری مەککەدا • وە هەر کەسێ یەکێ لەم پێنج ئادا بە نەکا ئەگەر لـــەبەر

بێ باوەڕی بێ ئەوە بە کـــافر ئەناسرێو ئەگـــەر لـــەبەر تەمەڵی بێ ئەوە بە یاسای دینی ئیسلام ئەبێ بـگا بە عیقابی خـــۆی لـە دنیاداو پاداشی ڕۆژی قیامەتیشی وا لە لای خودادا ، ئەو ئەزانێ چی پێ ئەکا . وە مـادام ئەو دوو شەهادەتە ڕووکنی ئیسلامەو لەسەر ئـــەو شەهادەتە دڵی موسوڵمان دابمەزرێ پێویستە هەرچی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی بە ڕاستی بزانێو هەرچی بە حـــەرامو ناڕەوای داناوە نەیـکاو هەرچی بە واجب داناوە بەجێی بێنێو هـەرچی بە مەندووب داناوە ئەگەر بیـکا ئیحسانەو ئەگەر نەیـکا بێ تاوانـــەو هەرچی بە (مکروه) داناوە ئەگـەر نەیـکا ئەوایی پێ ئەگـــاو ئەگـــەر بیکات تاوانی نیەو هەرچی بە (مباح) داناوە ئەوە کردنو نەکردنی وەکو یەك وانە . وا دەرکەوت کە ئەحکامی خودا لەسەر موسوڵمانی هۆشیاری بازدەساڵە پێنجن : واجبو حـــەرامو مەندووبو مەکروهو موباح ، کە کردنو نەکردنی وەکو یەکن .

وە پاش ئەوە کـــە شەهادەتی‌دا کە موحەممەد ـ صلی الله علیـه وسلم ـ پێغەمبەری خودایە ، پێویستە بە قەدەر دەستەڵات لەسەر ڕەویەو ڕێـــگەی ئەو بێ لە ئەخلاقو ڕەوشتدا . خودا فەرموویەتی : ( کان لـکم في رسول الله اسوة حسنة ) واتە : بێ‌گومان هەیە بۆ ئێوە لـــە زاتی حـــەزرەتی پێغەمبەردا پیشەو شوێن‌کەوتنێکی جـوان ، چونکی خوڵكو ڕەوشتی حەزرەتی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ڕەوشتێکی بەرزو بەڕێز بووە ، پێویستە موسوڵمان ئیمـــانو باوەڕی دامـــەزراو بێو ئیسلامیەتو ئادابی دینی ڕەسایی‌و صیدقی ببێ ، واتە ڕاســت وتـارو ڕاست کردار بێو صابیر بێ ، واتە خۆگر بێ لە بەرابەری مەینـــەتەوە بە وێنـــەی نەخۆشینو زیان‌کاری لە دارایی‌و ماڵداو وێنەی ئەمانە ، وە

خاوەن بەخشش بێو دەستو دەهندەی بێو خۆش ڕوو و خۆش وتارو خۆش کردار بێو دڵپاکو دڵخاوێن بێو دڵو دەستو دەمو داوێنی پاك بێ • خاوەن سوپاس بێ بۆ خودای تەعالاو بۆ هەر کەسێ حەقێکی لەسەری هەیە ، وەکو باوکو دایكو مامۆستاو خاوەن نیعمەتی دنیا • وە خاوەن عەفوو چاوپۆشی بێو عیززەتی نەفسی بێو بۆ شتی پەست دانەنەوێ • وە ئەگەر وەعدەیدا بە کەسێ بەجێی بێنێو درۆنەکاو غەیبەتو زەممی خەڵك نەکاو حەسوود نەبێو فیتنەیی نەکاو نەممام نەبێو عەیب نەدۆزێتەوە بۆ خەڵكو ناوو ناتۆرە دانەنێ لەسەر کەس و لەکاری ڕاستدا بە غیرەت بێو دڵئەستوورو پاڵەوان بێو بەرچاو گوشاد بێو هەر کەسێ پەنای پێهێنا بە قەدەر ئیمکان یارمەتی بداو لەسەر کاری چاکەو تەرکی خراپە ، بە ئیستیقامەتو دەوام بێو بە قەدەر ئیمکان لە بیروباوەڕو کردەوەدا خاوەن ئیخلاص بێ ، واتە کاری بۆ خودا بێ ، تا وا لە ئیمکاندا دوور بکەوێتەوە لە حەرام لە هەموو جیهەتێکەوە بەڵکو شوبهەیش ، زوهدو بێتەماعی لە دنیاداو عیززەتی نەفسو عیففەتو شەرمکردن کەمەشهوورە بە حەیا ، وە بێکینەیی ، واتە دڵصافیو غەیری ئەمانەیش کە زۆرن •

**ڕەوشتی بەرزی ڕەهبەری نازدار**
**نایێتە نووسین نایێتە وتار**
**( انك لعلى خلق عظيم )**
**بەسە بۆ باسی ئەخلاقی کەرەم**
**لەسەر ئەو یاسا ڕەوشتی مەردان**
**ئیمانەو ئیخلاص ئینصافو وژدان**
**صیدقو صەبرو حیلم عەفوو شەرافەت**

کەم تەماعی‌یەو زوهدو قەناعەت
تەواضوع بە حەق دەوامی طاعەت
کەرەم‌و بەخشش بە گوێرەی ئیمکان
چاوپۆشی بە حەق لە تاوانباران
داوێن پاکی‌یەو دەست‌و دەم پاکی
دڵپاکی یەعنی دەروون ڕووناکی
بێ‌گینە بژی لە ڕووی جیهانا
یەك دڵ‌و یەکڕوو لەگەڵ ئینسانا
دڵسۆزی بە حەق لەگەڵ داماوان
دەسگرتن (مطلق) بۆ لێقەوماوان
حورمەت‌گرتنی پیران‌و ئەشراف
بەخسوس لێقەوماو لە ناو یا ئەطراف
وەفا بە وادە بۆ گەورەو بچووك
بۆ داراو گەدا بۆ صینفی ملووك
حقووق ڕاگرتن بە ئەندازەی خۆی
سوپاسی نیعمەت چۆن هاتبێ بۆی
رەوشتی ڕەهبەر سەرمەشقە بۆمان
بە درێژی عومر بە توولی زەمان
( نامی ) بە فیدای خۆی‌و ئەخلاقی
ڕەحمـــەتی عامی هەموو ئافاقی

# نووري ئیسلام زانستی ئادابی دین

شەرتی واجببوونی نوێژ : ئیسلامیەتو بالغبوونو عەقڵە ، وە شەرتی بەجێهێنانیان : پاکی لەشو بەرگو جێگەی نوێژە لــە هــەر پیسی‌یەك عەفوی لێ نەدرابێ ، وە داپۆشینی عــەورەتە مابەینی ناوكو ئەژنۆی پیــاوو هەموو لەشی ژن ـ غەیری ڕوخسارو هەر دوو دەستی تا مۆچ ـ وە هاتنی کاتی نوێژەکانە ، بۆ صوبح لە بەیانەوە تا هەتاو کەوتن بۆ نیوەڕۆ لە زەوالەوە هەتا ئەو کاتە سێبەری هەر شتێ بــە قــەدەر خۆی لێبێ زیاد لە سێبەری کاتی زەوال ، وە بۆ عەصر لەو کــاتەوە تا ئاوابوونی ڕۆژەوە بۆ مەغریب لە ڕۆژ ئاوابوونەوە هەتا ڕووناکی سووری قەراخی ئاسمان ون ئەبێ ، وە بۆ عیشا لەم کــاتەوەیە هەتا بەیان • وە پاکی ئینسانە لە بێ دەسنوێژی‌و لە (جنابة) واتە لەش‌پیسی • وە ڕووکردنە لە کەعبەی پیرۆز لە شاری مەککەی موکەڕەمەدا •

وە دەسنوێژ دێتە جێ بە نیەتی لابردنی بێ‌دەسنوێژی‌و شۆرینی هەموو ڕوخسارو هــەردوو دەست لــە پەنجەکانەوە تا ئەنیشك ، وە مەسحی سەرو شورینی هەر دوو پێ هەتا قوولاپەکان •

وە دەسنوێژ تێك ئەچێ بە دەرچوونی شتێ لە بەرو دواوە ، وە بە دەس‌دان لە پێستی ژنی نامەحرەم ، وە دەس‌دان لە فەرجی ئینسان بــە بەری دەست ، وە دەس‌دان لە حەلقەی دوبوری ئینسان ، وە نوســتن بێ‌شێوەی دامەزرانی ژێر قنــگی لەسەر عەرز ، وە نەمانی عــەقل بە ناساغی یا بە هۆی هەر شتێکەوەبێ • وە جەنابەتو لەش‌پیسی لا ئەچێ بە نیەتی لابردنی لەش‌پیسی‌و بە شۆردنی هــەموو لەش بــە پێستو مووەوە ـ لە پاش لابردنی پیسی لەسەر لەش ئەگەر ببێ ـ وە ( شرعاً )

ئەم دەسنوێژو غوسڵە کاتێ بە سوودە کە ئینسان خۆی پاك کردبێتەوە لە پیسی لە بەرو دوای بە بێ بەرد یا بە هۆی شۆردنیان بە ئاوێکی وا پاكو پاکەوەکـــەر بێ •

وە ئەگەر لە شوێنێکدا ئاو نەبوو بۆ دەسنوێژ گرتن‌و خۆشۆرین ، یاخود ئاو هەبوو بەڵام لەبەر ساردی یا ناساغی بەکار نەدەهات ( تیمم ) پێویستە کە بریتی‌یە لەوە بە نیەتی حەڵاڵ‌کردنی نوێژ دوو جـار دەس بدەی بە سەر گڵێکدا تۆزی هەبێ ، لە جاری یەکەمدا هەموو ڕوخساری مەسح بـکاو بـــە جـاری دووەم هەردوو دەستی تا ئەنیشـــکەکانی مەســـح بـــکا •

وە ئەرکانی داخلیەی نوێژەکان هەژدەن : نیەت‌هێنان بۆ فەرزی نوێژی ئەو وەختەو ( الله اکبر ) کردن‌و خوێندنی فاتیحە بە ڕاوەستانەوەو ڕکووع واتە دانەوێنەوە وەهـا کـە هـەر دوو بەری دەستەکانی بگەنە ئەژنۆکانی‌و ڕاستەوەبوون بۆ ئیعتیدال‌و سوجدەبردن بە دانانی تەوێڵ بـە ڕووتی‌و هەر دوو ئەژنۆ بە داپۆشراوی‌و هەر دوو بەری دەست‌و بەری هەر دوو پێی لەسەر عەرزو ڕاستەوەکردنی سەری‌و دانیشتن‌و دووبارە سوجدە بباتەوە ، وەکو یەکەم • وە لەم ئیعتیدال‌و ڕکووع‌و سجوودو دانیشتنەدا ئارام بـگرێ‌و لە ئاخری ڕکاتی نوێژدا لە پاش سوجـــدە دابنشێ ( تحیات ) بخوێنێ بڵێ :

(التحیاتُ لله السلام عَلیكَ ایُّهَا النبيُّ وَرَحمةُ اللهِ وَبَرَکاتُهُ السَّلامُ عَلَینَا وَعَلی عبَاد الله الصَّالحینَ أشْهَدُ أنْ لا الهَ الاّ الله وَأشهَدُ أنَّ محَمَّداً رَسُول الله ، اللّهمَّ صَلِّ علی سَیِّدنا مُحمَّدٍ وعلي آل محمَّد کَما صلَّیت علی ابراهیم وعلی آل ابراهیم في العالمین

انك حميد مجيد ) وه بەم ڕێزە نوێژەکەی تەواو بکاو جا سەلام بداتەوەو بڵێ : ( السلام عليكم ورحمة الله ) بۆ جاری یەکەم ٠

وە سوننەتەکانی نوێژ لە پێش چوونە ناوی نوێژەکەوە : بانگدانە لە ئەوەڵی کاتەوە بە عیبارەتی مەشهوور ٠ وە قامەتکردن لە پێش دابەستنی نوێژەکەدا وەکو عادەتە ٠ وە لە پاش داخڵبوون لە نوێژەکەدا قنووت خوێندنە لە ئیعتیدالی ڕکاتی دووەمی صوبحداو لە وەتری نیوەی دووەمی مانگی ڕەمەزان ٠ وە تەحیاتو صەلاوات خوێندنی یەکەمە ٠ وە غەیری ئەمانە هەموو لە هەیئەتی نوێژن ئەوانەش یازدەن : بەرزکردنەوەی هەر دوو دەست لەگەڵ ( الله اكبر )ی نیەت دابەستنو لە کاتی ڕکووعو سەر بەرزەوەکردن لە ڕکووع ٠ وە دانانی دەستی ڕاست لەسەر موچی دەستی چەپ ٠ وە دۆعای ( افتتاح : وجهت وجهی) تا ئاخرو ( اعوذ بالله من الشيطان الرجيم ) لە پێش فاتیحەو خوێندنی (آمین) لە ئاخری فاتیحە ٠ وە خوێندنی سوورەتێ قورئان لە پاش فاتیحە لە دوو ڕکاتی یەکەمو دووەمدا ٠ وە بە ئاشکرا خوێندن لە جێگەی خۆیدا ٠ وە پەنامەکی خوێندن لە جێگەی خۆیدا ٠ وە ( الله اكبر ) خوێندن لە کاتی سەر دانەواندنو سەر بەرزکردنەوە ٠ وە خوێندنی : (سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد) لە کاتی بەرزەوەبوون لە ڕکووع ٠ وە تەسبیحات لە ڕکووعدا بە ( سبحان ربّي العظيم وبحمده ) ٠ وە لە سوجدەدا بە ( سبحان ربي الاعلى وبحمده ) ٠ وە دانانی هەر دوو دەست لەسەر ڕان لە دانیشتندا ، دەستی چەپی بڵاوبکاتەوەو دەستی ڕاستی بقونجێنێ مەگەر پەنجەی شەهادە ئەوە ئیشارەتی پێبکا لە کاتی (شهادتین)دا ٠ وە دانیشتن بە (افتراش) واتە لەسەر بازنەی پێی چەپیو پشتی پێی بکاتە لای عەرزەوە لە هەموو

دانیشتنەکانیدا • وە (تورك) لە دانیشتنی تەحیاتی دوایدا لەسەر وڵمەی ڕانی چەپی و پێی چەپی دەرکا لە لای ڕاستەوە • وە سەلامدانەوەی دووەم بەلای چەپدا ئەوەندە کە لایێ ڕوخساری ببینرێت •

وە ئـەو شتانەیش کـە نوێژ بەتاڵ ئەکەنەوە دە شتن : وتاری عەمدی • وە سێ حەرەکەی ئەعزای بە شوێنی یەکدا • وە دەسنوێژ شکانو لەش پیس بوون • وە پەیدابوونی پیسی لەسەر لەشو ئەعزاو جێگەی نوێژ • وە دەرکەوتنی عەورەتی • وە گۆڕینی نیەتی خـۆی وەکو ئەوە بڕیار بدا کـە نوێژەکەی نەکا • وە پشت کردن لـە قیبلە • وە خواردنو خواردنەوە • وە پێکەنین بە قاقا • وە کوفر کردن ـ پەنا بە خـودا ـ •

ئەمانە کورتە باسێ بوون پێویستە موسوڵمان بیانزانێ ، وە بۆ درێژەی ئاداب پێویستە موسوڵمان موراجەعەی زانای دینی جێگە بکا •

## نوێژی جومعـه

نوێژی جومعە دوو ڕکاتە لە شوێنی نوێژی نیوەڕۆ لـە ڕۆژی جومعەدا • وە شەرطی واجب بوونی ئەم نوێژە : ئیسلامیەتەو بلوغو عەقڵو نێرینەیی و تەندروستیو وەتەنیەت ، واتە ئەو شـوێنە وەتەنی کـابرا بێ •

وە شـەرتی بەجێهێنانی ئەمەیە : شوێنەکە شار بێ یا لادێیەکی وا بێ نیشتمان بێ بۆ خەڵکەکەیو دەرنەچن لێی مەگەر بۆ ئیحتیاجی • وە چل پیـاوی دارای شەرتەکانی تێدا بێ • وە کاتی نیوەڕۆ باقی بێ • وە واجبـە لـە پێش نوێژەکەدا خەطیب دوو خوطبـە بخوێنێ بـە

ڕاوەستانەوەو لــە بەینی ئەواندا دابنیشێ بە ئەندازەی خوێندنی سوورەتی ئیخلاص‌و لە هــەر دوو خوطبەکاندا حەمدی خوداو صەلاوات لەســەر حەزرەتی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ بدا بە ناوی خۆی • وە وەصیەت بە تەقوابێ • وە لە یەکێکیاندا ئایەتێ قورئان‌و لەویاندا دۆعــا بۆ موسوڵمانان بێ ، جا خەطیب پاش خوطبەکان دوو ڕکات نوێژ بـــە نیەتی فەرزی نوێژی جومعە بە ئیمامــەت بێنێ‌و بە جەماعەت نوێژەکە تـــەواو بــکەن •

وە لە سوننەتەکانی جومعەیە خۆ شۆرین لە بەینی کاتی بەیان تا پێش زەوال • وە بەرگی سپی لەبەرکاو نینۆك بــکاو بۆنخۆشی بەکـــار بێنێ ، وە لە کاتی خوطبەخوێنـــدنی خەطیبدا بێدەنگ بێ • وە یەکێ هاتە مزگەوتەوە لە کاتی خوطبەخوێندنی ئیمامدا دوو ڕکات نوێژ بـــکا بە نیەتی سوننەتی پێش نوێژی جومعە ئەگەر ئەو سوننەتەی نەکرد بێ ئەگەر نا بە نیەتی نوێژی دیاری مزگــەوت •

وە جەماعەت لە نوێژی جومعەدا فەرزی عەینەو لە باقی نوێژەکاندا فــەرزی کیفایەیە ، یاخــود سوننەتی موئەککەدەیە • وە واجبە لەســەر مەئموم نیەتی جەماعەت لە هەموو نوێژێکدا بە جەماعەت بکرێ ، وە لە نوێژی جومعەدا لەسەر ئیمامیش نیەتی ئیمامەت واجبە •

## نوێژە سوننەتەکان

گەورەترینی عیاداتی بەدەنی نوێژە ، وە گەورەترینی نوێژی سوننەت نوێژی جەژنەکـــانە ، جا نوێژی ڕۆژگیران ، جـــا نوێژی مانگ‌گیران ، جا نوێژی باران‌بارین ، جـــا نوێژی وەترە (تاق) وە لای

کەمی ئەم نوێژە یەك ڕکاتە ، وە لای زووری یازدە ڕکاتە ، وە کاتەکەی وا لە بەینی نوێژی عیشاو دەرکەوتنی بەیان ( فجر )دا ۰ وە دروستە بۆ کەسێ زیاد لە ڕکاتێ بکا یەك تەحیات بخوێنێ لە ڕکاتی ئاخرداو سەلام بداتەوە ، یا دوو تەحیات بخوێنێ لە دوو ڕکاتی ئاخردا خواه ڕکاتی ئاخر لەگەڵ ئەواندا بکا یا جیای کردبێتەوە لێیان ۰ وە ئەگەر سێ ڕکاتی کرد سوننەتە لە ڕکاتی یەکەمدا سورەتی ( الاعلی )ێ لە دووەمدا سوورەتی ( الکافرون )و لە سییەمدا سوورەتی ئیخلاص‌و هەر دوو ( معوّذه )کان بخوێنێ ۰

جا گەورەتری نوێژە سوننەتەکان لە پاش نوێژی وەتر سوننەتە ڕاتبە موئەککەدەکانە کە دە ڕکاتن : دوو ڕکات لە پێش نوێژی صووبح‌و دوو ڕکات لە پێش نوێژی نیوەڕۆو دوو ڕکات لە پاش نوێژی نیوەڕۆو دوورکات لە پاش نوێژی مەغریب‌و دوو ڕکات لە پاش نوێژی عیشا ، وە ئەم دە ڕکاتە هەموو وان لە یەك پایەدا ، جا ڕاتبە غەیرە موئەککەدەکان کە دوو ڕکاتی تر لە پێش نیوەڕۆو دوو ڕکات لە پاش نیوەڕۆوەو چوار ڕکات لە پێش عەصرداو دوو ڕکات لە پێش عیشادا کە ئەکاتە دوازدە ڕکات ۰ جا گەورەترین نوێژی (تراویح)ە لە شەوانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا بە نیەتی قیامی ڕەمەزان ۰

جا سوننەتی تەراویح یا نوێژی تەراویح ڕیوایەت کراوە لە حەزرەتەوە ـ صلی الله علیه وسلم ـ ( انّ الله تعالی فرض علیکم صیام رمضان وسننت لکم قیامه ) وە ئەم نوێژە دوو ڕکات دوو ڕکات ئەکرێ‌و لە پاش هەموو چوار ڕکاتێکدا کەمێ ئیسراحەت ئەکەن ، وە ئەگەر نیەتی چوار ڕکات بێنن ئەوە نوێژەکەیان بەتاڵ ئەبێ ۰ وە ئەم سوننەتە لە ساڵی دووەمی کوچیدا لە لایەنی حەزرەتەوە لە شەوی بیست‌و سێیەمی

مانگی ڕەمەزاندا حەزرەت ـ صلى الله عليه وسلم ـ لە کاتێکی درەنگ لە شەودا دەرچووو هەشت ڕکاتی کرد لە مزگەوتداو ئەصحابەکانیش لەگەڵ ئەودا بە جەماعەت نوێژەکەیان کرد ، وە لە صبەینێ خەڵك بۆ ئەم نوێژەیان کردو حەزرەت لە شەوی بیست‌و پێنجدا هاتەوە بۆ ئــەو نوێژەو یاران ئیقتیدایان پێ‌کردو هەشت ڕکاتیان کرد ، وە لە شەوی بیست‌و حەوتدا هاتــەوەو گەلــێ ئەصحابە حــازر بوون هەشــت ڕکات نوێژیان کرد • ئیتر پاش ئەم سێ شەوە حەزرەت نەهاتەوە ، کە عەرزیان کرد : بۆچی تۆ تەشریفت نەهاتەوە ؟ فەرمووی : ترسام خودا فەرزی بکا لە سەرتان • وە ڕیوایەت کراوە حەزرەت ـ صلى الله عليه وسلم ـ لە ماڵی خۆیدا بیست ڕکاتی کردووە •

( فقد أخرج البيهقي عن ابن عباس ـ رضي الله عنهما ـ كان يصلي ـ صلى الله عليه وسلم ـ في شهر رمضان عشرين ركعة والوتر • كما في حاشية الشوكاني على منتقى الأخبار • وعن أبي ذر الغفاري ـ رضي الله عنه ـ قال : صمنا مع النبيّ ـ صلى الله عليه وسلم ـ رمضان فلم يقم بنا شيئًا من الشهر حتى بقي سبع ، فقام بنا حتى ذهب ثلث الليل ، فلمـــا كانت السادسة لم يقم بنا ، فلما كانت الخامسة قام بنا حتى ذهب شــطر الليل ، فقلت : يارسول الله لو نفّلتنا قيام هذه الليلة • أي : لو أحيينــا بموافقتك بقية ليلنا بصلاة النافلة • فقال : ان الرجل اذا صلى مع الامــام حتى ينصرف حسب له قيام الليلة • قال : فلما كانت الرابعة ، أي : آخر الشهر ، لم يقم • فلما كانت الثالثة جمع أهله ونساءه والناس فقام بنــا حتى خشينا ان يفوتنا الفلاح • فقلت : وما الفلاح ؟ قال : السحور • ثم لم يقم بنا بقية الشهر • رواه أصحاب السنن بسند صحيح • فقد روي من أبي ذر في صلاته ـ صلى الله عليه وسلم ـ في هذه المرة الثالثة أنهــا

كانت عشرين ركعة • كما في حاشية : تاج الأصول ) •

وا دەرکەوت کە ئەصڵی نوێژی تەراویح سونەتە بە بەجێهێنانی حەزرەت ـ صلی اللّه علیه وسلم ـ وە جەماعەتیش لەو نوێژەدا سونەتە بە دەلیلی ئەوە کە حەزرەت مەنعی ئەو ئەصحابانەی نەکرد کە ئیقتیدایان پێ کرد •

وە ژمارەی ڕکاتەکانیشی گەیشتووەتە بیست ڕکات لە سەر ڕیوایەتی بەیهەقی لە ( ابن عباس )ەوە ـ رضي اللّه عنهما ـو ڕیوایەتی ئەبو ذەڕی غەففاری ـ رضي اللّه عليه ـ ( مع انه ) عیبارەتی حەزرەت ـ صلی اللّه علیه وسلم ـ کە فەرمووی : ( وسننت لكم قيامه ) کە ( قيام الليل )ی ڕەمەزان سونەتەو هەر چەند ڕکات نوێژی تێدا بکرێ بە نییەتی ( قيام الليل )ی ڕەمەزان درۆستە ، کە وابێ ئەو کردەوەی حەزرەتی عومەرە ـ رضي اللّه عنه ـ کە پاش ساڵێ لە خەلافەتی خۆی کاتێ چاوی کەوت بە ئەصحابەکان ژن‌و پیاو بە جیا هەر یەکێ بۆ خۆی نوێژ ئەکا ، وەهای بە باش زانی کە پیاوانی گرد کردەوە لە لای ( أبيّ بن كعب )وە ژنەکانیشی گرد کردەوە لە لای ( سليمان بن ابی حشمة ) کە پیاوێکی مسکین‌و پیر بوو • وە بە جەماعەت نوێژ بکەن هەتا بیست ڕکات لە هەموو دوو ڕکاتێکدا سەلام بدەنەوە • وە هەموو ئەصحابەکانی عوثمان‌و عەلی‌و فوقەهای مەدینەو گەورە صەحابەکان لە مەدینەو مەککەدا بەم کارە ڕازی بوون‌و ئیجماعیان هاتە جێ لەسەر ئەم نوێژی تەراویحە • کە وابێ ئەم نوێژی تەراویحە بە بیست ڕکات بوو بە سونەت لە دینی ئیسلامدا • وە وتاری موخالیف لەم مەوزوعەدا خیلافی شەرعی ئیسلامە •

جا گەورەتر لە نوێژە سونەتەکان ( صلاة الضحى ) چاشتە نوێژە لە بەینی هەتاو بەرزەوەبوون بە قەدەر ڕمێ‌و کاتی زەوال • ژمارەی لە دوو

ڕکاتەوەیە هەتا هەشت ڕکات یا دوازدە ڕکات ، سەلام بداتەوە لە هەموو دوو ڕکاتێـکدا ٠

جا دوو ڕکاتـەی ئیحـرام بە حەج یا بە عەمرە لە پێش بەستنی ئیحرامەکەدا ٠ جا دوو ڕکاتی طەواف کە لە پاش طەوافدا ئەکرێن ٠ جا دوو ڕکاتی ( تحية المسجد ) ٠ جا دوو ڕکاتی سوننەتی دەسنوێژ ٠

وە سوننەتە دوو ڕکات نوێژ لە ماڵی خۆیدا بۆ ئەو کەسە ئەڕوا بۆ سەفەرێ ، وە دوو ڕکات لە مزگەوتدا پاش هاتنەوەی لەو سەفەرە لە پێش ئەوەدا ئەڕواتە ماڵەوە ٠ وە دوو ڕکات سوننەتی پاش بانگ لە پێـــش قامەتدا ، وە دوو ڕکات سوننەتی ئیستیخارە لە یەکەم ڕکاتدا (الكافرون)و لە دووەمدا ( الاخلاص ) بخوێنێ ٠ وە دوو ڕکات ( صلاة الحاجة )وە بازێ ئەڵێن دوازدە ، لە ڕکاتی یەکەمدا سوورەتـی ( الكافرون )و لـە دووەمدا سوورەتی ( الاخلاص ) بخوێنێ ٠ جا پاش سەلامدانەوە حەمدو تەسبیحی خودا بکا صەڵاوات لە حەزرەت ــ صلى الله عليه وسلم ــ بداتو داوای نیازەکەی بـکا ٠ وە سوننەتی ( آوابين ) لـە بەینی مـەغریبو عیشاداو لای کەمی دوو ڕکات لای زۆری بیست ڕکاتە ٠ وە سوننەتی ( صلاة التسبيح ) چوار ڕکاتە بە ڕۆژدا بە یەکەوەو لە شەودا دوو دوو ، لە پاش نیەت هێنان لە پێش خوێندنی فاتیحە پازدە جار بڵێ : ( سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله أكبر )وە ئیمامی غەزالی ــ رحمـه الله ــ لە ( احياء العلوم )دا فەرموویەتی : ئەمەیش زیاد بکا ( ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم ) وە لە ڕکووعدا پاش (سبحان ربي العظيم) دە جارو لە ئیعتیـدالدا دە جـارو لە هەر دوو سوجدەکانـداو دانیشتنی مابەینیانداو جلووسی پاش سوجدەی دووەمدا دە جار ، مەجموعی حەفتاو پێنج تەسبیح لە هەموو ڕکاتێکدا ٠ وە ژمارە بۆ نوێژی سوننەتی (مطلق)

نیه کەمو زۆری عایدی خواستی نوێژکەرەکەیە .

وە هەر سوننەتێ کە وەختی تایبەتی بێ مادام فەوتا قەزاکردنەوەی سوننەتە . وە سوننەتە نوێژی ( صلاة التهجد )و عەدەد بۆ نوێژەکانی نیە . وە ئەگەر لە پاش نوستن بکرێ ئەوە پێی ئەڵێن ( تهجد ) واتـە تەرکی نوستن ، ئەگەرنا ناوی ( قیام اللیل )ە . وە دواخستنی بۆ سێیەکی ناوەڕاستی شەو گەورەترە .

## کام نوێژی سوننەت جەماعەت مەشرووعە تیایدا

ئەو نوێژە سوننەتانە کـە بە جەماعەت تەشریع کراون : نوێژی وەترە لە تەواوی مانـگی ڕەمەزانی پیرۆزدا ، وە نوێژەی جـــەژنی ڕەمـــەزانو قوربان ، وە نوێژی ڕۆژگیرانو مانگ‌گیران ، وە نوێژی داوای بارینی باران ، وە غەیری ئەمانە دامەزراون لە بـــەر (انفراد)و یەکە یەکەو جەماعەت سوننەت نیە تیایانداو بە (انفراد) حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ بەجێی‌هێناون . وە ئەگــەر بـــە جەماعەت بـکرێن هەرچەند ناتوانین بڵێین ئەوە حەرامــە یا مەکرووهە ؛ لەبەر ئەوە ئـەم حوکمانە بـە نەهی ثابیت ئەبن ، بەڵام لـە کتێبی ( ایضـاح ) تەئلیفی ئیمـــامی نــەوەوی بـــە نەقڵ لـە ماوەردی‌یەوە ئەفەرموێت :

( واعلم انه لیس للأمیر ان ینکر علیهم ما یسوغ فعله الا أن یخاف اقتداء الناس بفاعله . انتهی . قال الشیخ ابن حجر في حاشیته : ظـاهر کلامه جواز الانـکار حینئذ ، وله وجه ویحتمل وجوبه وهو الأقرب ؛ لما یترتب علی ذلك من المفاسد ـ والله اعلم ـ انتهی ) .

بینا لـە سـەر ئەم فەتوای ئبنو حەجەرە لەم ڕۆژەدا کـــە علم

کەم بووە واجبە لەسەر ئەو کەسە دەستی ئەڕوا مەنعی نوێژی جەماعەت بکا لە هەر نوێژێکدا کە بە جەماعەت مەشرووع نەکرابێ، وەکو نوێژە ڕاتبەکانو نوێژی ( صلاة التسبیح )و غەیری ئەمەیش - والله اعلم - ٠

وە پێویستە بزانن کە مەکرووهە لەسەر فەرش یا بەڕەو ڕووی شتی یا لە ناو بەرگێکی وادا کە صوورەتێکی وای تێدابێ نوێژکەرەکە غافڵ بکا ٠ وە لە جێگەی مۆڵی حەیوانێکدا کە ئازار بگەیێنێ ، وەکو وشترو گای تۆچوەشێن ٠ وە لە ناو حەمامداو لە شوێن جل داکەندنەکەیدا ، وە لەسەر جێگەی زبڵ وەکو سەلوێنك ئەگەر فەرشێ پاك لەوێدا رابخا ، ئەگەرنا هەر نوێژەکەی بەتاڵە ، وە لەسەر ڕێگەی ناو خانوداو لە قەصابخانەدا ، وە لە ناو شیودا لە کاتی لافاودا ، وە لە ناو کەنیسەدا کە جێگەی عیادەتی جوولەکەیەو لە کلیسای گاورەکاندا ، وە لە هەر شوێنی جێگەی عیصیانو تاوانباریو لەهوو لەعب بێ وەکو سینەماو جێگەی شەرابخواردنەوەو هاو وێنەی ئەوان ٠

هەروا مەکرووهە نوێژکردن لە قەبرستانێکدا هەڵنەوەشابێتەوە ، بەڵام ئەگەر هەڵوەشابێتەوەو فەرش لە ژێر ئینساندا نەبێ ئەوە نوێژەکە بەتاڵە ، لاکین کە بەرماڵ لە ژێر پێدا بوو مەکرووهە٠

وە بۆ حاڵیبوونی موسوڵمانان لەم مەوزووعە ئەڵێم : مەزهەبی ئیمامی حەنەفی ئەمەیە کە مەکرووهە نوێژ لە قەبرستاندا کاتێ کە قەبرەکە لە پێش نوێژکەرەکەوە بێ بە جۆرێ کە چاوی بەرەو سوجدەگاکەی بڕوانێ قەبرەکە ببینێ ، بەڵام ئەگەر ئەو قەبرە لە پشتێوە یا لە تەنیشتێوە بێ وەها کە چاوی پێ نەکەوێ ئەوە زیانی نیەو نە حەرامەو نە مەکرووهە ٠

وە مەزهەبی ئیمامی مالیك ئەمـەیە كە نوێژ لە قەبرستاندا دروستە بە بێ كەراهەت ئەگەر نوێژكەر ئەمین بێ لە پیسی جێگەی نوێژەكەی ، بەڵام ئەگـەر پیس بوو ئەوە ئەگەر فەرشی لە ژێردا بوو مەكرووهـەو ئەگەر هەر لەسەر عەرزە پیسەكە بوو ئەوە نوێژەكە بەتاڵە •

وە مەزهەبی حەنبەلی‌یەكان ئەوەیە كە نوێژ لە شوێنێـكی وادا سێ قەبر یا زیاتری تێـــدا بوو حەرامە ، بەڵام ئەگەر دوو قەبر یا قـەبرێ بوو ئەوە نوێژەكە دروستە بە بێ كەراهەت ، ئەگەر وەزعەكـەی وابێ ڕوو نە كاتە قەبرەكان ئەگەرنا مەكرووهە •

وە مەزهەبی شافیعی ئەوەیە نوێژ لە قەبرستاندا مەكرووهـــە (مطلقا) خواە قەبرەكان لـە پشتەوە بن یا لە پێشەوە لە راستەوە بن یا چەپەوە ئیللا قەبری پێغەمبەرانو شەهیدان ئەوە نوێژ لەوێدا دروستە بێ كەراهەت ئەگەر قەصدی (تعظیم)ی خاوەن قەبرەكە نەبێ وە ئیللا حەرامـــــە •

وە تەحقیقی مەوزووعەكە ئەمەیە كە نوێژكردن بەرەو ڕووی قەبری پێغەمبەرانو شەهیدانو ئەولیاو صالحان ئەگەر مەبەس (تعظیم)ی ئەوان بێ حەرامە ، وە ئیللا مەكرووهە • وە فەرموودەی ( لا تتخـــذوا قبري مسجداً ) لەسەر مەبەستی ئەو (تعظیم) كردنەیە ، وە ئەممـا نوێژ كردن لە مزگەوتێكدا نزیكی حوجرەی قەبرستان بێ ئەوە دروستە •

هەروا پێویستە بزانن چـەن كات هەیە كە حەرامە نوێژكردن لەو كاتانەدا ئیللا نوێژێ كە سەبەبێكی بێ وەكو سوننەتی دەسنوێژ یـــا ( تحية المسجد ) یا قـەزای نوێژی فەوتاوی سابیق • ئەو كاتانە : پاش كردنی نوێژی صوبح تا ڕۆژ دەرئەچێو بە قەدەر ڕمێ بەرز ئەبێتـەوە•

وە لـە کـاتی زەوالو لادانی ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان هەتا لەو خـەتە لائەدا ، بەڵام لە غەیری ڕۆژی جومعەدا ؛ چونکی لە جومعەدا دروستە لەو کاتەدا نوێژ بـکەی • وە لە پاش نوێژی عەصر هەتا ڕۆژ ئاوا ئەبێو لە چاو ون ئەبێ • وە ئەم حەرامی نوێژە بۆ غەیری حەرەمی کەعبەیە ، لەوێ لە هەر کاتێکدا نوێژ بـکەی شەوو ڕۆژ ڕەوایەو مانیع نیـــە • ئەمانە ئەحکامێکن واجـــە بیزانن •

## نووري ئیمان بە ڕۆژوو

ئیمـان بە ڕۆژوو ئەمەیە کە باوەڕت بێ هەموو ساڵێ مانـــگی ڕەمـەزان بە ڕۆژوو بی • وە شەرتی واجببوونی ڕۆژووی ڕەمـەزان ئیسلامیەتەو بلووغەو عەقڵو تەوانایی‌یە لەسەر ئەو ڕۆژووە •

وە فەرزی ڕۆژوو چوار شتە : یەکەم نیەتو قەصدی ئەوە کـە سبەینێ بە ڕۆژوو بێ ڕۆژووی ڕەمەزان ، وە ئەم نیەتە لە کاتی شـەودا بێ • وە خۆگرتن بە دوور لە خواردنو خواردنەوەو جیماع‌کردنو لە خۆڕشاندنەوە بە عەمدی • وە ئەوەی کە ڕۆژووی پێ ئەشکێ دە شـتە هەر شتێ کە بە عەمدی بـکاتە ناو سکەوە یا ناو سەرو بـکاتە مەثانە ، یا لـە دواوە وەکو شاف جێگە بـگرێ • وە ڕشانەوەی عـەمدی • وە وەطئی عەمدی لە فەرجی گیان‌لەبەردا • وە هێنانەخوارەوەی ئاوی مەنیو واریـد بوونی عوزری شەرعیو خوێنی زەیستانی بەسەر ژندا • وە شێتیو ڕیدده ، واتە گەڕانەوە لە ئیسلامەوە بۆ کوفر ــ والعیاذ بالله ــ •

وە سونتەتە بۆ ڕۆژووگر زوو ئیفطار بـکاتەوەو درەنگ پارشـێو بـکاو تـەرکی وتاری پووچـــی بێ‌سـوود نارەوا بـکا • وە حەرامە

ڕۆژووی ( یوم الشك ) کە ڕۆژووی ئەووەڵ ڕۆژە بۆ کاتێ یەکێ بڵێ : ڕەمەزانەوە یەکی بڵێ : ڕەمەزان نیە •

وە هەر کەسێ لـە ڕۆژووی ڕەمەزاندا لە کاتێکدا بە ڕۆژوو بێ بە عەمدی وەطئی ژن یا غەیری ژن بـکا ئەوە واجبە قەزای ئـەو ڕۆژە بـکاتەوەو دوو مانگ لەســەر یەك بە ڕۆژوو بێ یا نانی شەست مسکین بدا ، وە تەوبەیش لەو گوناهە بـکا • هەر مسکینێ چواریەکی صـاعێ لە دانەوێڵەی قووتی ئیختیاری •

وە ئینسانێ لەبەر پیری نەتوانێ بە ڕۆژوو بێ دروستە کەفارەت بدا لە باتی ڕۆژووەکەی کە ئەوەیش موددێکە کە عیبارەتە لـــە نیو کیلۆ لـــە قووت •

وە ژنێ منداڵوەبەر بێ یا حاملە بێو ترسی زیانی هـــەبێ لـــە ڕۆژووگرتندا دروستە بە ڕۆژوو نەبێ تا هەلی بۆ هەڵئەکەوێو قەزای ڕۆژووەکەی ئەکاتەوە ، جا ئەگەر ترسی لە منداڵەکەی بوو کەفارەتیشی لەسەر واجبە کە موددێ طەعامە •

بزانن ثابیتبوونی ڕەمەزانو واجبوونی ڕۆژووەکەی یا بـــەوە ئەبێ کـە مانـگی شەعبان بە سی ڕۆژە تەواو ببێ ، وە یاخود ئینسانێکی پیاوی عادڵ شەهادەت بدا لەسەر چاوپێکەوتنی مانگ •

وە هـەر کاتێ لە وڵاتێکدا چاوپێکەوتنی مانـگی یەك شـــــەوەی ڕەمـــەزان ثابیت بوو ئەوە ڕۆژوو واجب ئەبێ لەسەر ئەهلی ئەو وڵاتەو هـەر وڵاتێـکی وا کە لە ڕۆژئاوای ئەو شوێنەوە بێ ، بەڵام واجب نابێ لەسەر ئەهلی وڵاتێ کە لە خۆرهەڵاتیەوە بێو بە ئەندازەی گۆڕانی (مطلع) دوور بێ ؟ چونـکی ئێمـە کـە مەزهەبمان مەزهەبی ئیمـــامی

شافیعی‌یە ئیعتیبار ئەکەین بە ئیختیلافی (مطالع)و قابیلە لە ولاتی ئێمەدا مانگ ببینرێ‌و لە شوێنێکی تردا نەبینرێ کە وابوو حوکمی ئێمە ناڕوا بۆ ئەوان •

بەلام مەزهەبی ئیمامی حەنەفی‌و ئیمامی مالیك‌و ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەو ڕەئیەیە کە ئیعتیبار بە ئیختیلافی ( مطالع ) ناکرێ‌و مادام لە ولاتێکدا مانگ بە شەهادەتی شەرعی ثابیت بوو ئەوە لەسەر هەموو موسولمانان دوورو نزیك ڕۆژووگرتن واجب ئەبێ • هەروا بۆ (ثبوت)ی جەژنی ڕەمەزانیش مادام لە ولاتێکدا ثابیت بوو حوکمەکەی ئەگات بە هەموو ولاتێك •

جا لەم زەمانەدا کە ئیختیلاف لە ناو موسولمانان‌دا زۆرەو ئیختیلافیش گەلێ زیان ئەدا بە موسولمانان بە یەکی‌یەکەو بە کۆمەلی زۆر موناسبە موسولمان بۆ ئەووەلی مانگی ڕەمەزان‌و بۆ ئەووەلی مانگی شەوالیش کە جەژن دایێ تەقلیدی فەرموودەی ئەو سێ ئیمامە بکەن لەگەل هەموو ولاتی ئیسلامدا نیەتی ڕۆژووی ڕەمەزان بهێنین ، وە یا جەژن بکەین •

هەر وەها تەقلیدی ئەو ئیمامانە بۆ بەجێهێنانی ئادابی حەج واسیطەی خێرو ئاسایشی دلی ئینسانە ؟ چونکی ڕاوەستانی موسولمانان لە عەرەفاتدا وا ئەبێ لەسەر حسێبی ئەو ئیمامانە ئەبێ کە ئەلێن سبەینی نۆیەمی مانگی قوربانەو پێویستە حاجیان لە عەرەفاتدا ڕاوەستن • زۆر بە سوودە موسولمانان ئاگایان بێ لەم مەوزووعانە هەتا هەموو دلیان ئاسایش بگرێ •

# نووري ئیمان بە زەکات

زەکات لـە دینی ئیسلامدا بریتی‌یە لە صەرف کردنی ئەندازەیەکی دیاری لە دارایی خاوەن ماڵ بۆ ئەو جۆرە ئادەمی‌زادانە کـــە خودا باسی کردوون ٠

ئەم زەکاتە ڕوکنێکی بە ڕێزە لە ئیسلامدا ، وە لە ئەندازەی چل و سێ ئایەتدا لە قورئانی پیرۆزدا باسی کراوە ، وە جێگەیەکی گەورە ئەگری لە ژیواری موسوڵمانان ٠ زەکات لە پێنج جۆر ماڵدا هەیە ٠ لـە ماڵیاتدا وەکو وشترو گاو مەڕو بزن ، وە لە نەختینەدا وەکو زێڕو زیو ، وە لە بەهرەی کشتو کاڵداو لە بەری درەختی خـــاوەن بەردا وەکو مێوو دارخورما ، وە لە پارچەی بازرگانی یا ماڵی تیجارەتدا هەر شتێ بێ ٠

جا شـەرتی زەکات لە حەیواناتدا ئیسلامیەتو موڵـکی تـەواوو تەواوبوونی حەددی نیصاب ، واتە ئەو ئەندازە کە زەکاتەکەی تێـــدا واجبە ، وە تەواوبوونی ماوەی دوازدە مانگە بە سەریاندا ، ئەوســـا زەکاتەکەیان واجب ئەبێ ٠ وە لـە وڵاتی ئێمـەدا وردە حەیوان زۆرن ، وە زەکاتیان وایە کـە لە چل سـەردا یەك سەر واجبە تا صەدو بیستو یەك سـەر ، جـا دوو سەر واجبـە هەتا ئەبێ بە دووصەدو یەك سەر ، جا سێ سـەر هەتا ئەگاتە چوارصەد سەر جا چوار سەر واجب ئەبێ ٠ پاش ئەوە لە هـەموو صەد سەردا سەرێ واجبە ٠ وە بەچکەی ژمـارەی نیصاب لە جێگەی دایکیاندا دائەنیشن ، وە ئەگـــەر ئەوەندە زۆر بوون ژمارەیان گەیشت بە نیصابی دووەم ئەبن بە هۆی واجب بوونی زەکـاتی ئەو نیصابە ٠ مەسەلا : چل سەر یا پەنجا سەر مـــەڕت بوو زایینو بەچکەکان زۆر بوون گەیشتن بە صەدو بیستو یەك دوو سـەر واجبـە

سەرێ لە گەورەکانو سەرێ لە بچووکەکان ، هەروا تەماشای ژمـارە بـکەن •

وە نیصابی زەکاتی کشتوکاڵ پێنج ویسقە کە بە تەنەکەی نەوتی عادەتی ئەکاتە چلو پێنج تەنەکە ، وە بە کێشانە ئەکاتە حەوصەدو بیست کیلۆ ، وە کاتێ بارەچەی ئەو کشتوکاڵە قووت بوو وەکو گەنمو جۆو برنجو زووڕاتو نیسكو ماشو نۆك ئەوە مـادام لـە ئاوی باران یا جۆبار پێ بـکەن دەیەك واجبـە لەوانە • وە ئەبێ بزانن هەرچی لـە توێکڵدا بێ ئەگا وەکو چەڵتوكو پەرشە ئەوە نیصابەکەی دە ویسقە ، وە کاتێ گەیشتە ئەو حـەدە ئەویش دەیەکی تێدا واجبە • وە ئەگـەر بە دۆڵچە ئاو درا بیستیەك واجبـە •

وە نیصابی ئاڵتون بیست مسقاڵە ، وە شەرتی زەکـاتی ڕابوردنی ساڵە بە سەریدا • وە نیصابی زیو دوو صەد درەم زیوە کە ئەکاتە صەدو چل مسقاڵ زیو ، وە هەر مسقاڵێ پێنج غەرامە (تقریبا) وە واجبی ئەمانە چلیەکە واتە لە بیست مسقاڵ ئاڵتون نیو مسقاڵو لە چـل مسقاڵدا مسقاڵێو لە دووصەد درەمدا پێنج درەم واجبە ، وە کاتێ زیادیان کرد لە نیصاب بە حسێبی چلیەك زەکاتی ئەدرێ • وە کاتێ بە ئیعتیـاری مانـگی موحەڕەم ـ مەسەلا ـ نیصابێکت بوو و لە مانـگی صـەفەردا نیصابێکی ترت دەس کەوت ئەوە بۆ ئەم وەجبـەی دووەمە لـە مانـگی صەفەرەوە ساڵ حسێب ئەکرێ ، وە ئەگەر خاوەن ماڵەکە بە هـەمووی لەسەر ئیعتیاری موحەڕەم لە موحەڕەمی دووەمدا زەکاتیان بدا ئەوە ئەبێ بە زیادە ئیحسان بۆ ئەو کەسە •

بزانن لەم چەرخـەدا دەوڵەتەکان پارەی نەختیـان لابردووەو کاغەزیان داناوە لە جێگەیان • لەم صووورەتەدا تەماشا بکەن کاتێ کـە

کاغەزەکە لەباتی پارە دانراوە هەرچۆن قیمەتیان بۆ داناوە ئەو قیمـــەتە تەماشا ئەکرێ ـ مەسەلا ـ لە عیراقدا وەختی خۆی هەر مسقاڵێ لـــە ئاڵتون بە دوو دینـــار دانراوە ، ئەوکاتە هــەر کەسێ چل دینار کاغەزی لابێ‌و ساڵی بە سەراها تێپەوە ئەوە ئەو کاتە نرخی بیست مسقاڵ ئاڵتون بوەو زەکاتە کەی دیناری‌بوە لەسەر چل‌یەك ئیتر لەم ئەوراقی نەقدی‌یەدا تەماشای نرخی بازاڕ ئەکرێ بۆ ئاڵتون ئیستە مسقاڵی شەست دینـــارەو نیصاب ئەکاتە هەزارو دووصەد دینار ؟ چونکی ئیمە بەسراوین بە نرخی حکوومەتەوە ، وە حکوومەت وەختی خۆی مسقاڵی بە دوو داناوە ، وە ئەگـــەر حکوومەت ئەو ئەوراقە بەتاڵ بکاتەوە نە کەم‌و نە زۆر قیمـــەتی نامێنـــێ •

وە لەســـەر تاقیق نرخی دووصـــەد درەم عیبارەتە لـــە صەدو چل مسقاڵ زیو ئەکاتە صەدو چل دینار ، وە لە صەدو چل مسقاڵەکە ئەکاتە صەدو چل دینار زەکاتەکەی سێ دینارو نیوە •

وە نیصابی ماڵی بازرگانی وەکو ئاڵتون‌و زیوە ئەگەر بە ئاڵتون ئەو ماڵەت پەیداکردبێ ئەبێ لـــە ئاخری ساڵدا هـــەر بە ئاڵتون قیمـــەتی دابنرێ ، وە ئەگـــەر بە زیو بێ ئـــەبێ بە زیو قیمـــەت بـــکرێ‌و زەکاتەکـــەی بدرێ •

وە زەکاتی ســـەری ئینسانیش واجبە کە پێی ئەڵێن : زەکـــاتی (فطر) واتە زەکاتی ئینسانی مەخلووق ، وە شەرتەکانی سێ شـــتە : ئیسلامیەتەو بوونە پێش غرووبی ڕۆژ لە ئاخر ڕۆژی ڕەمەزاندا ، واتـــە یارۆ پێویستە پێش غرووبی ڕۆژی پێش جـــەژن مەوجـــود بێ ، وە میقداریکیش لـــە شـــەو پاش مەغریب هەر مەوجوود بێ • کـــە وابێ یەکێ پێش مەغریب ئاخر ڕۆژی ڕەمەزان بمرێ فیطرەی لەسەر واجب

نابێ هەروا ئەگەر لە پاش غرووبی شەوی جەژن لە دایك ببێ فیطرەی واجب نیە ، وە ئەم فیطرە واجبە لەسەر ئینسانێ کە قووتی شەوو ڕۆژی جەژنی ببێو زیاد لەوەیش دارایی ببێ ئەوسا واجبە کە فیطرەی خۆیو هەر کەسێ کە والە ئیدارەیداو نەفەقەی واجبە لەسەری ، وەکو ژنو منداڵی ناباڵغو منداڵی باڵغی کە فەقیر بن یدا بە موستەحەق .

وە میقداری فیطرە یەك صاعە لە غالبی قووتی ئەو شوێنە تیـــدا ئەژی ، وەکو : گەنم یا جۆ یا غەیری ئەوانە . وە صاع دوو کیلۆو نیـــوە تەقریبـەن .

وە زەکاتی فیطرە یا زەکاتی ماڵ ئەدرێ بەو هەشت صینفە کـــە خودای تەعالا لە قورئانی پیرۆزدا ناوی بردوون بە فەرموودەی خـۆی ( انّما الصدقات للفقراء والمساكين والعاملين عليها والمؤلفة قلوبهم وفـي الرقاب والغارمين وفي سبيل الله وابن السبيل ) وە لەم چەرخی ئێمـەدا چوار صینفیان ماون کـە بریتین لە : فوقەراو مەساکینو غـاریمینو ئیبنوسەبیل . جا فەقیر ئەوەیە کە ماڵێ یا کەسبێ وای نەبێ کە جێگەیێ بگرێ لە ئیحتیاجییەکەی . وە میسکین ئەوەیە ماڵی ببێ یا کەسبی ببێ بەڵام کیفایەتی نەکا ، وەکو ئینسانێ حەوت درەم پەیدا ئەکاو موحتاجـە بە دە درەم ـ مەسەلا ـ وە غاریم : قەرزارە ، وە مەبەس لە قەرزار لە زەکاتدا ئەوەیە کـــە قەرزار بووبێ بۆ کوژاندنەوەی فیتـــەیێ لـەناو موسوڵماناندا ، ئەمە با خۆیشی دارا بێ لە ماڵی زەکات قـەرزەکەی بۆ ئەدرێتەوە ، هەروا کەسێ کە قەرزی کردبێ بۆ میوانداری یا کردنەوەی مزگەوت یا مەدرەسە یا تازەکردنەوەیان یا بۆ دروست کردنی پرد یاخود ڕاگرتنی طەلەبەی علوومی دینییەو وێنـەی ئەمانە ، هـەروا کەسێ قەرزی کردبێ بۆ نەفسی خۆیو ماڵو منداڵی لە مەصرەفی واجبـاتدا یا

مەباحدا ، یا صەرفی کردبێ لە حەرامدا بەڵام ئیستە تەوبەی کردبێ‌و باوەڕمان وابێ تەوبەکەی ڕاستە ، ئەوە بە ئەندازەی ئەو قـەرزەی پێ ئەدرێ بە مـەرجێ خـۆی عاجیز بێ لە تەسلیمی ئـەو قەرزە بـە خاوەنەکەی ، هەروا کەسێ بووبێ بە ضامن بۆ کەسێ کە نەتوانێ لـە کاتی دانەوەی حەقەکەدا بیداتەوە ، وە ئەو ضامنە حەقەکە تەسلیم بـکا بە خـاوەنی •

وە صینفی موسافیر = ابن السبیل = کەسانێکن لە سـەفەردا بێ خـەرجی مابنەوەو ماڵیان نەبێ ، یاخود دەستیان نەگا بە ماڵەکەیان • هەروا کەسانێ کە بیانەوێ سەفەرێکی واجب یا سوننەت یا مەباح بکەن‌و خەرجیان بە دەستەوە نەبێ ئەمانە دروستە زەکاتیان پێ بدرێ •

وە ئەوانە کـە زەکاتیان پێ‌ئەدرێ ئەبێ موسوڵمان بن‌و لـە بەنی هاشم‌و بەنی موطەلیب نەبن ئەگەر لە خومسی ( بیت المال ) مەصرەفیان پێ بدرێ ، بەڵام ئەگەر خومسیان پێ‌نەئەدراو بەر صینفێ لەو صینفانە نەکەوتن ئەوە زەکاتیان پێ ئەدرێ •

هـەروا دروست نیە ئینسان زەکـات بدا بە کوڕو کچی باڵغی موحتاجی ؛ چونـکی نەفەقەیان واجبە لە سەری ، بەڵام ئەگـەر ئەوانە قەرزار بوون دروستە باوکەکەیان لە ماڵی زەکات بە قەدەر قەرزەکەیان پێ بدا ، هـەروا کوڕی ئینسان کـ ( طالب العلم ) بێ‌و محتاج بە کتێبی عیلم بێ دروستە باوکەکەی لە ماڵی زەکـات میقداری قیمەتی ئـەو کتێبانەی پێ بـدا •

هـەروا یەکێ بتوانێ بە کاسبی خـۆی ژیوار پەیدا بـکا بەڵام موحتاج بێ بە ژن‌هێنان‌و پارەی نەبێ دروستە لە ماڵی زەکات ئەوەندە

پارەی پێ بدرێ ژن بێنێ ، هــەروا ئەگەر موحتاجی خانوو بێ دروستە مقداری کیفایەتی خانووەکەی پێ بدرێ ؛ چونــکە ئەم جۆرە شتانە لــە جوملەی ئیحتیاجیانی ئینسانن •

وە ئەگەر کەسێ کوڕی خاوەن ژنی بوو کە میسکین بوو یا کچی خاوەن مێردی بوو کە موحتاج بوو دروستە لە صوورەتی یەکەمدا زەکات بدا بە ژنی کوڕەکەی‌و لە دووەمدا بیدا بە مێردی کچەکەی تا صــەرفی بــکەن لە ئیحتیاجی ماڵەکەیان •

وە دروستە صەرفی زەکات بۆ فاسق مەگەر کابرا بزانێ صەرفی ئەکا لە تاوانبـــاریدا •

وە واجباتی ذیممەی موسوڵمان وەکو : مەنذورات‌و کــەفارات‌و حەیوانی ئادابی حەج وەکو ذەبیحەی ( تمتع وقران ) یا قوربانی واجب بە نەذر ـ مەسەلا ـ وەکو زەکاتن لە صەرف‌کردنیاندا بۆ ئەو صینفانــە کــە خودای تەعالا ناوی بردوون لە قورئاندا •

وە بزانن کــە دروستە فەقیرو میسکین کیفایەتی عومری غــاڵب وەربگرن ـ کە عیبارەتە لە مابەینی شەست‌و حەفتا ساڵ ـ واتە کــەسێ کاسبی پێ نەکرێ دروستە ئەوەندە زەکات وەربگرێ کـــە کیفایەتی عومری غاڵبی بــکا • وە تەکلیفی کەسب ناکرێ لە ئینسانێکی عــالم‌و زانا کە تەدریسی علوومی دینیە بــکا یا مەشغووڵی تەحصیلی علووم بێ ، بەڵێ ئەگــەر یەکێ تەواناى کەسبی بوو بەڵام حەزی لەوە ئەکرد کــە مەشغووڵی (نوافل) بێ وەکو نوێژی سوننەت‌و خەڵوەت‌و ئــەم جــۆرە شتانە ئەوە دروست نیە زەکاتی پێ بدرێ‌و پێویستە کاسبی‌بکا •

وە لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ واجبە

ئەم زەکاتە بدرێ بە سێ کەس لە هەر صینفێ لەو صینفانە کە هەن لە زەمانی زەکاتدەرەکەدا • وە هەروەها واجبە بە موستەحەقی ولاتی ئەو ماڵی زەکاتە بدرێو نە گوێزرێتەوە بۆ شوێنی تر ، بەڵام گەلێ لە پێشەوایانی مەزهەبی شافیعی فەرموویانە : دروستە زەکات بدرێ بە یەك کەس لە یەك صینف لەو هەشت صینفانە کە قورئان ناوی بردوون ، هەروا دروستە نەقل بکرێ بۆ ولاتی دووریش بەتایبەتی ئەگەر ئەو کابرای موحتاجە لە خزمو خوێشی کابرا بێ ، وە یا کەسێ بێ کە قازانجی بۆ دینی ئیسلام زۆر بێ •

هەروا دروستە خاوەن ماڵ وەکیل بگرێ بۆ تەسلیمی زەکات بە موحتاجان وەکو دروستە کە موحتاجەکان یەکێ بکەن بە وەکیلی خۆیان کە زەکاتیان بۆ وەربگرێ •

وە واجبە خاوەن ماڵ نیەتی زەکاتدانی بێ لەو کاتەدا کە ماڵی زەکات جیا ئەکاتەوە یا لەو کاتەدا کە تەسلیمی وەکیلی ئەکا بیدا بە داماوان • وە بە قەطعی پێویست نیە کابرای خاوەن ماڵ بە زمان بڵێ بە داماوەکە : ئەم ماڵە زەکاتە ، حەتتا بە ناوی دیاری‌یەوە پێیبدا دروستە • هەروا لە بازێ مەزهەبدا دروستە کابرا لە باتی دەرکردنی زەکات لە عەینی ماڵەکەیدا قیمەتەکەی بداو ئەو قیمەتەیش پارەی نەخت بێ یا مادەی پێویست وەکو بەرگو پۆشاك دروستەو تەقلیدی ئەوانە کافی‌یە بۆ هەموو عومری ئینسان •

### نووری (اعتکاف) واتە مانەوە لە مزگەوتدا

مانەوە لە مزگەوتدا سوننەتێکی گەورەیە کە بە نیەتی عیبادەتو ئیطاعەی خودا بێ • لە واقیعدا ئینسان کاتێ کەناری گرت لە دەنگو

باسی دونیــاو دڵی ڕووی کرده خوداو بیرکردنەوە لە تەنهایی قـــەبرو مانەوەی ماوەی بەرزەخ دڵی نوورانی ئەبێو ڕوو ئەکـاتە بیرو بلوەڕو کردەوەی باش •

ئیعتیکاف دوو شــەرتی هــەیە : یەکەم قەصدی مانەوە لە مزگەوتدا لەبەر ڕەزای خودا • وە دووەم مانەوە لە مزگەوتەکەدا ئەوەندە کە لــە عورفدا پێی بڵێن : مانەوە • وە شەرتی دروستی ئەم ئیعتیکافە ئیسلامیەتو عەقڵو پاکی لە جەنابەت = لەش‌پیسی = و خوێنی حەیزو زەیستانی • وە ئەگەر ئیعتیکافەکەی مەندوور بوو واتە نەزری کردبوو لەسەر خۆی بمێنێتەوە لە مزگەوتدا پێویستە لە ئەووەڵی مانەوەکەدا نیەتی ئەوەی بێ کە فەرزە لەسەریو جێبەجێی ئەکا • وە کاتێ ئیعتیکافەکەی مەندوور بوو نابێ لە مزگەوت دەرچێ لە ماوەی ئیعتیکافەکەیدا مەگەر بۆ قەزای حاجــەت یا خۆشۆرینی لــەش‌پیسی یا دەستنوێژگرتن یا لەبەر نەخۆشینێ کە لەگەڵ ئەو نەخۆشی‌یەدا نەتوانێ لە مزگەوتدا بمێنێتەوە • و ئیعتیکاف بەتاڵ ئەبێتەوە بە وەطئیو بــە موباشەرە بــە ئارەزوو ئەگــەر ئینزالی = ئـاوی = لەگەڵدا بــێ •

## نووري حەج واتە زیارەتی کەعبەی موبارەك

خودای تەعالا حەججی کردووە بە ڕوکنێ لە ئەرکانی ئیســلام لەســەر کەسێ تەوانایی بێ لە گــەڵ باقی مەرجەکاندا خــودای تەعالا فەرموویەتی ( ولله علی الناس حجّ البیت من استطاع الیه سبیلا ) واتە : بۆ خودا هەیە لەسەر موکەللەفان حەججی کابە بۆ هەر کەسێ توانا بێ •

شەرتی واجب بوونی حەج ئیسلامو بلووغو عەقڵو تۆشەو بوونی

شتێ سواری بێ وەکو سەیارە لەم چەرخەدا ، وە ڕێگەیش خاڵی بێ لە مانیع ، وە چلۆن حەج واجبە لە مەزهەبی ئیمامی شافیعیدا ـ رضی الله عنه ـ عومرەیش واجبە ، بەڵام عومرە لە هەمو ڕۆژانیساڵدا جێبەجێ ئەبێ ئیللا لە کاتی بەجێهێنانی ئادابی حەجدا ، لاکین حەج هەر لە مەوسیمێکی تایبەتیدا ئەکرێ لە ساڵدا ، وە هەموو وەختەکەی لە مانگی شەوالەوەیە هەتا چواردەیەمی مانگی قوربان ( ذي الحجة ) • وە لە ئادابیشدا فەرقیان هەیە ؛ چونکی ڕاوەستان لە عەرزی عەرەفاتداو شەو مانەوە لە میناو موزدەلیفەداو ڕەجمی شەیتان لە سێ ڕۆژی پاش ڕۆژی جەژن،هەر ڕۆژێ بۆ سێ کۆگا بەردەکان،وە لە ڕۆژی جەژندا بۆ کۆگای گەورە ، ئەمانە لە عومرەدا ناکرێن •

دەلیل لەسەر وجووبی هەردوویان ئەم ئایەتەیە کە خودا فەرموویەتی : (وأتموا الحج والعمرة لله) واتە حەج‌و عومرە تەواو بکەن بۆ خودا •

## ئادابەکانیان

حەج‌و عومرە بە سێ یاسا بەجێ دێن لە مەزهەبی ئێمەدا بە یاسای ( افراد ) گەورەترە کە ئەمەیە : لە ئەووەڵەوە حاجی ئیحرام ببەستێ بە حەج‌و پاش تەواوکردنی ئادابی حەج بڕوا ئیحرام ببەستێ بە عومرەو ئادابەکەی بەجێ بێنێ •

ئەرکانی حەج پێنجە ئیحرام لەگەڵ نیەتی داخڵ بوون لە حەجداو مانەوە لە خاکی عەرەفە لەڕۆژی نۆیەمی ( ذي الحجة )دا هەتا ڕۆژ ئاوا ئەبێ یا لە شەوی دەی ( ذي الحجة )دا ، وە حەوت جار هەڵسووڕان بە دەوری خانووی کەعبەی موبارەکدا بە یاسای شەرعی‌و حەوت جار

هاتوچۆ بە مابەینی صەفاو مەروەدا بە یاسای شەرعي ، وە سەرتاشین یا کورتەوەکردنی مووی سەر هەمووی یا بازێکی ، وە ڕیزراگرتن لە بەینی زۆربەی ئەو ئادابانەدا •

وە ئەرکانی عومرە ئیحرامو طەوافە بە دەوری کەعبەداو سەعیی لە بەینی صەفاو مەروەدا ، وە سەرتاشین یا کورتەوەکردنی مووەکانی •

وە واجباتی حەج غەیری ئەو ئەرکانانەی وتمان ئەمەیە کە ئیحرام لە میقاتی شەرعی‌یەوە بێ بە کاتو شوێن •

جا میقاتی کاتی بۆ حەج مانگی : شەوال ، (ذي العقدة)و دە ڕۆژ لە ئەووەڵی ( ذي الحجة )وە •

وە میقاتی مەکانی بۆ ئەهلی حەرەمی مەککە شوێنی خۆیانە لە هەر ئاوەدانی‌یەکدا بین ، وە هەروا بۆ غەیری ئەوان لەوانەی کە وان لە بەینی میقاتو حەرەمدا هەم شوێنی خۆیانە • وە بۆ غەیری ئەوان بۆ یەکێ لە خەتی مەدینەی مەنووەرەوە بڕوا ( ذو الحليفة ) یە کە ئیستە مەشهوورە بە ( بیری عەلی ) • وە بۆ ئەهلی شاماتو ئەوانە لە ساحیلی شیمالی‌یەوە یا لە میصرەوە بێنە بەری ئەم بەر ( جحفة )یە کە لە نزیکی شاری ( جده )دایە • وە بۆ ئەوانە لە جانبی عیراقەوە بڕۆن (ذات عرق)ە ئیستە لە ( عقيق )دا ئیحرام ئەبەستن • وە بۆ ئەوانە کە لە جانبی نەجدی حیجازەوە یا نەجدی یەمەنەوە بڕۆن ( قرن )ە • وە بۆ ئەوانە کە لە تیهامەی یەمەنەوە بڕۆن ( يَلملم )ە ، وە کەسێ بەسەر ئەو شوێنانەدا نەڕوا لە حاستی ئەوانەوە ئیحرام بەستی ، هەروا بۆ کەسێ بڕوا بۆ عومرە حوکمی جێگەی ئیحرام بەستنی ئەوە بوو کە باسمان کرد • وە مادام تەجاوزی کرد لەوانە فیدیە واجب ئەبێ لەسەری •

**بێـــداوبن :**

ئەوانە کە لە فڕۆکە ( طیارە )دا ئەڕۆن بۆ حەج یا عومرە ، یــا کاتێ سواری طەیارەبوون ئیحرام ببەستن ، یاخود بڵێن بە طەیارەچی لە پێش ئەوەدا بگەن بە موقابیلی شوێنی ئیحرامی خۆیان خەبەرداریان بکەن تا لە ناو طەیارەدا بەرگی خۆیان لابەنو ئیحرام ببەستن ، ئەگەر طەیارە تەجاوزی کرد لەو شوێنە فیدیەیان لەسەر واجب ئەبێ ٠

بەڵێ بۆ ئەوانە کە لەو بەری دەریای سوورەوە بەرانبەر بە شاری (جدّة) دێنە ئەم بەرەوە یا لــە یەمەنەوە لە قەراغی دەریاوە دێن دروستە لە شاری (جدّە) دا ئیحرام ببەستن ٠

وە واجبی دووەمی حــەج ڕەجمی شەیتانە لە هەرسێ کۆگاکان لە ماوەی سێ ڕۆژدا ، ڕۆژی یازدەو دوازدەو سیازدەی مانگی (ذی الحجة) بە عەلاوەی ڕۆژی جەژن کــە ڕەجمی شەیتان ئەکا لە کۆگای گەورەدا ، وە لەو سێ ڕۆژەدا هەرسێ کۆگاکان ڕەجم بـکا ٠

وە سوننەتەکانی حەج حەوتە : یەکەم ( افراد ) وەکو وتمان حەج بـکا لە پێش عومرەدا ٠ دووەم ( لبّیك ) کردنو لەفظەکەی : ( لبّیك اللّهمّ لبّیك لا شریك لك لبّیك ان الحمد والنعمة لك والملك لا شریك لك ) وە لە پاش ئەوە صەڵەوات بدا لە سەر حەزرەتی پێغەمبەر ــ صلی الله علیه وسلم ــ وە داوای بەهەشت بـکا لە خودا پەنای پێ بـگرێ لە ئاگری دۆزەخ ( ربنا آتنا في الدنیا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عـذاب النار ) ٠ وە ( طواف القدوم ) کە گەیشتە مەککە حەو طــەواف ٠ وە شەو لە ( منی )دا بمێنێتەوە کــە ڕۆیشت بۆ عەرەفەو کاتێ لــە عەرەفــە هاتە خوارەوە شــەو لە موزدەلیفەدا بمێنێتەوە ٠ وە لە پاش طــەوافی

کەعبەی موبارەك دوو ڕکات نوێژ بـکا لە مەقامی ئیبراهیمدا • وە کاتێ ڕۆیشتەوە بۆماڵی خۆی ( طواف الوداع ) حەوت جار •

وەلە کاتێکەوە ئیحرام ئەبەستێ واجبە لەسەر پیاو خۆی ڕووت بـکاتەوە لە بەرگی دووراوی عادەتیو دوو فۆتە لە خۆیەوە بپێچێ یەکێ بۆ ناوشانو پشتو سنگی تا ناوکیو یەکێ بۆ بەینی ناوكو ئـەژنۆی ، بەڵام ژن لـە بەرگی خۆیدا ئەمێنێتەوەو پێویستە ڕوخسارو هـەر دوو بەرو پشتی دەستەکانی بە دەرەوە بن تا مووچەکان •

## ئەوەی حەرامە لەسەر ئەهلی ئیحرام

بە شێوەی گشتی حەرامە لەسەر خاوەن ئیحرام لەبەرکردنی بەرگی دووراوو داپۆشینی پیاوو ژن بۆ سەریان بەڵێ بۆ ژن بازێ لە ڕوخساری بە دەرەوە بێ ، وە حەرامـە مووی سـەری دابێنێ وەیا بتـاشێ ، وە حەرامـە لەسـەریان نینۆك کردنو خۆ بۆنخۆش کردنو ژن مارەکردنو ژن بەشوودان ، واتە عەقدی نیکاح بۆ خۆیو غەیری خۆی ، وە کوشتنی نەچیرو جیماع کردنو تێکەڵی ژن بە ڕووتی لەگەڵ ئارەزووی نەفسدا • وە بە هەموو ئەم شتانە کە کران واجبە فیدیەی بدا ئیللا عەقدی نیـکاح ئەوە هـەر دانامـەزرێ •

وە هیچ شتێ حـەج بەتاڵ ناکاتەوە ئیللا جیماع لـە فەرجدا • وە ئەگـەر بەتاڵەوە بوو حەجەکەی لەسـەر فەرز ئەبێ لە سـاڵی دوایـدا قـەزای بـکاتەوە ، وە پێویستە وشترێك سەربڕێ لە فیدیەی ئـەوەدا ، ئەگـەر وشتری دەس نەکەوت گـایێ سـەربڕێ ، ئەگەر بۆی نەکرا حـەوت مەڕ ، ئەگـەر بۆی نەکرا وشترەکە قیمەت بکا بە دانەوێڵە بیدا بە داماوانی حەرەم ، ئەگەر ئەوەی بۆ نەکرا لەباتی هەموو موددێ لـەو دانەوێڵە ڕۆژێ بە ڕۆژوو بێ •

## تەرکی ئادابی حەج

هەر کەسێ ڕوکنێکی تەرك کرد لە ئەرکانی حەج ئەوە حەجەکەی بەتاڵەو واجبە قەزای بکاتەوە ، وە ئەگەر واجبێ لە واجباتی تەرك کرد یا کارێ لە حەرامەکانی کرد فیدیەی لەسەر واجب ئەبێ • وە ئەگـەر سوننەتی تەرك کرد ئەوە قەید ناکا •

## بەیانی فیدیە لە حەجدا

ئەو فیدیانەی کە پێویستن لە حەجدا پێنج قیسمن :

یەکـەم فیـدیەی تەرکی واجبێکە لە واجبات ، وەکو : تەرکی ڕیعایەتی میقات لە ئیحرامبەستندا ، یا تەرکی ڕەجمی شەیتان لە یەکێ لە کۆگاکانا ، یا لە هەموویاندا • ئەمە لەسەر تەرتیبو ڕیزە : واجبە لەسەری حەیوانێ سەربڕێ کـە بۆ قوربانی بشێ ، جا ئەگەر ئەمەی بۆ نەکرا دە ڕۆژ بە ڕۆژوو بێ ، حەوت ڕۆژ لە ماوەی حەجدا بەڵام لـە غـەیری ڕۆژی جەژنو ( ایام التشریق )دا ، وە سێ ڕۆژ لەماڵی خۆیدا کـە گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی ، ئەگـەر لە حەجدا ڕۆژووی بۆ نەگیرا هەمووی بیاتەوە بۆ وڵاتی خۆی بەڵام بەینی حەوت ڕۆژو سێ ڕۆژەکە بخا با بە یەکـەوە نـەبن •

دووەم فیدیەیێ کـە واجب ئەبێ بە سەرتاشینو غەیری سەرتاشین لـە ئەسبابی ڕوفاهو ڕابواردن ، وەکو : خـۆ بۆنخوش کردنو ژن ماچ کردن ، ئەمە لەسـەر تەخییرو خاتر خواهی‌یە ، یا حەیوانێ سەربڕێ وەکو وتمان ، یا سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێ ، یاخود سێ صاع دانەوێڵە بـدا بە شەش مسکین یەکی نیو صاع ، وە زوو باسمان کرد صاع دوو کیلۆو نیـوە ( تقریبـا ) •

سێیەم فیدیەیەکە واجب ئەبێ بە هۆی (احصار)ەوە یانی مەنعی حاجیان لە حەج ئەمە واجبە حەیوانێ بنێرێ بۆ حەرەمی مەککەو کاتێ گەیشتە مەککە ئیحرام بشکێنێ ، واتە سەری بتاشێو چی ئەکا بیکا ؛ چونکی ئیحرامەکەی نەماوە .

چوارەم فیدیەیەکە واجب ئەبێ بە کوشتنی نەچیر ، ئەمەیش لەسەر تەخیرو خاترخۆیی‌یە ، جا ئەگەر نەچیرەکە وێنەی بوو وەکو بزنەکێوی ئەوە یا وێنەکەی سەرببرێ بۆ فەقیران ، وە یا بە ئەندازەی قیمەتەکەی دانەوێڵە بدا پێیان ، یا لەباتی هەر موددێ ڕۆژێ بە ڕۆژوو بێ .

پێنجەم فیدیەیەکە واجب ئەبێ بە جیماع ، ئەمەیش لەسەر تەرتیبو ریزە ، وەکو باسمان کرد لە پێش ئەم باسەدا .

بزانن حەیوان سەربڕین یاخود ئەحکامی طەعام لە فیدیەدا هەر ئەبێ لە عەرزی حەرەمدا بێ بۆ فەقیرانی ئەوێ ، بەڵام ڕۆژوو لە هەر لایەك بێ دروستە . وە ئاگادار بن لە هیچ کاتێکدا کوشتنی صەیدی حەرەمو بڕینی دارو درەختی دروست نیە .

## نووری زیارەتی حەزرەتی فەخری کائینات ـ صلی الله علیه وسلم

کاتێ کە ئینسانێ حەجی تەواو کرد بە ئیخلاصو ئەدەبەوە ڕوو بکا لە مەدینەی مونەووەرە بۆ زیارەتو دڵی خۆی ڕووناك بکاتەوە بە پرتەوی جیهان‌ئارو عالەم‌گیری ئەو زاتە کە خاتەمی (الانبیاء والمرسلین)ەو ڕەوانەکراوە بە ڕەحمەت لە بۆ عالەمین ـ صلی الله علیه وسلم ـ ( الی یوم الدین ) .

وە دەلیل لەسەر ئەم مەوزوعە گەلێکن :

یەکەم ڕیوایەت کراوە لە ئەنەسی کوڕی مالیك ـ رضی الله عنه ـ فەرموویە : حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویە : ( من زارني محتسبا كان في جواري وكنت له شفيعا وشهيدا يوم القيامة • رواه ابن أبي الدنيا ) واتە : هەر کەسێ زیارەتم بکا لەبەر ڕەزای خـــودا ئەوە نزیـکی من ئەبێ‌و لە پەنای مندا ئەبێ لە ڕۆژی قیامـــەتداو ئەبم بـه تکاکاری‌و شاهید لەسەر ئیمـــانی •

دووەم ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ـ رضي الله عنهما ـ فـــەرمووی : کـــه حەزرەت ـ صلی الله علیـــه وسلم ـ فەرموویەتی : (من زار قبري وجبت له شفاعتي • رواه الدارقطني) واتە: هەر کەسێ لە موسوڵمانان زیارەتی قەبری من بکا ئەوە شەفاعەتی من بۆ ئەو کەسە واجب ئەبێ •

سێیەم دارەقوطنی ڕیوایەتی کردووە کە حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : ( من زارني بعد موتي فكأنما زارني فـــي حياتي ) وە ئەم حەدیثە چاکترینی حەدیثەکانە لە جیهەتی ئیسنادەوە •

چوارەم لـــە پێش دەرکەوتنی ئەهلی بیدعەت‌و خیلافدا موسوڵمانان ئیجماعیان بوو لەســـەر ئەوە کـــه زیارەتی حەزرەت ـ صلی الله علیـــه وسلم ـ لە (مهمات)ە بەڵـکو بەعزێ لە عولەما فەرموویانە کە : زیارەتی پاش وەفاتی واجبە ؟ لەبەر ئەوە ئـــەو زیارەتە ئەبێ بـــه هۆی هێزوو ئەستووری ئیمان کە واجبی موسوڵمانەو موقەددیمەی واجب واجبە •

ئەوەی لـــه ئەووەڵی ئەم کتێبەوە نووسراوە تا ئەم شوێنە بە کورتی باسی ئەرکانی ئیمان‌و ئیسلام بوو ، کـــه ئەکاتە یازدە ماددە شەشی لـــە ئوصوولی دین‌و پێنجی لە فرووعی دین • پێویستە ئینسانی موسوڵمـــان

ئەمانە بزانێ‌و بەجێیان بێنێ •

جا پاش ئەوانە چەند ئەنوارێـکی خاوەن پرتەو هەن پێویستە وەکو چرای بەرق یا گڵۆپی کارەبا تەقدیمیان بـکەین بە برادەرانی ئیسلام بۆ ئەوە لە ڕێـگەی ئیسلامدا ئیستیفادەیان لێ بکەن بە عینایەت‌و یارمـــەتی خودای تەعـــالا •

## نوری یەکەم :
## ئیمان ئیسلامییەتەو نەصیحەتەو موخەببەت

ئیمان صیفەتی ئینسانەو برێتی‌یە لـــە باوەڕ کردن بە وەی کـــە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ لـــە لای زاتی خوداوە هێناویە بۆ خاوەن شعووران‌و زانینی ئەوە کە ئەوانە حەققن ، بەڵام ئەم زانیاری‌یە کافی نیە بەبێ ئەوە کە دڵی ئینسان ئارام بگرێ بەرابەر بە وەی کـــە باوەڕی پێ هەیەو ئیطاعەی ڕۆحی بێ بۆی ، ئەوەیش عیبارەتە لـــــە ئیسلام ، واتە ئینقیادو گەردن‌کەچی‌و ڕازی‌بوون بە وانەو ئیعلانیان بکاو دەریان برێ بۆ ئەهلی جیهان ، خودای تەعالا فەرموویەتی : ( الـذین آتیناهم الـکتاب یعرفونه کما یعرفون ابنـاءهم وان فریقـا منهم لیکتمون الحق وهم یعلمون ) ئایەتی / ١٤٦ لە سوورەتی بەقەرە •

وە فەرموویەتی : ( وجحدوا بها واستیقنتها انفسهم ظلمـا وعلوا ) ئایەتی ١٤ لە سوورەتی نەمل •

وە لەسەر ئەم ئەساسەیە کە خودای تەعالا ئیعتیباری تەسـليمی کردووە لەگەڵ ئیمانداو فەرموویەتی : ( وما زادهم الآ ایمانا وتسلیما ) ئایەتی /٢٢ لە سوورەتی ئەحزاب •

جا مادام تەسلیم پەیدا بوو لەگەڵ ئیماندا ئەو کاتە ئینسان ئەبێ بە ئینسانێکی موخلیص‌و ساغ‌و صاف بەرابەر بەو یاسایە وەری‌گرتووەو ئەبێ بە ناصیح بۆی • وەکو تەمیمی داری ڕیوایەتی کردووە لە حەزرەتەوە ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : ( الدین النصیحة ، قلنا : لمن یارسول الله ؟ قال : لله ولکتابه ولرسوله ولأئمــة المسلمین وعامّتهم • رواه مسلم ) واتە : دینی ئیسلام عیبارەتە لە ئیخلاص‌و مەیلی خێرو چاکە بۆ خوداو بۆ ئەو کتێبە خودا ناردوویە بۆ پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـو بۆ فەرمانڕەواکانی ئیسلام‌و بۆ عامەی ئەوانیش بەم مەعنا ئینسان ئیرشادیان بکاو ڕێگەیان پێ نیشان بدا •

جا کاتێ ئیمان‌و ئیسلام‌و نەصیحەت لە دڵی موسوڵماندا پەیدا بوون ئەوسا مەحەبەت پەیدا ئەبێ بەرابەر بە خوداو کیتاب‌و پێغەمبەرو ئیمامانی ئیسلام‌و عامەکەیان ، وە ئەم مەعنایە ئەوە ئەگەیێنێ کە دین مەحەبەتە بۆ خوداو بۆ کیتابی خوداو بۆ ئەو ڕەهبەرەیش کە کیتابەکەی بۆ هاتووەو بۆ ئیمامانی ئیسلام ، کە لە یەکەم پایەدا عیبارەتە لە ئەصحابەکانی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـو زانایانی دینی ئیسلام‌و ئەو پیاوە صالحانە کە ئەبن بە هۆی ڕووناککردنەوەی دڵی موسوڵمان ( الأمثل فالأمثـــــل ) •

جا مەحەبەتی خودا لەسەر ئەو ئەساسە کە پەروەردگاری عالەمە لەگەڵ هەموو ( محتویات )یداو ئینسانی دروست‌کردووەو هەڵیناوە بۆ عیلم‌و زانیاری‌و کەسبی پیرۆزی نەبڕاوە •

مەحەبەتی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەبەر ئەوە کە خودای تەعالا ناردوویەتی بە ڕەحمەت بۆ هەموو عالەم‌و ئینسانی لە

تاریکی کوفرو نەزانین دەر کردووە بۆ ڕووناکی عیلمو ئیمانو ئەخلاقو ئادابو ڕەوشتی چاکە ، بۆیە حەزرەت - صلی الله علیه وسلم - فەرموویەتی :

( والذی نفسي بیده لا یؤمن أحدکم حتی أکون أحبّ الیه من نفسه وولده ووالدیه والناس أجمعین ) .

وە مەحەبەتی ئەصحابەیش لەسەر ئەو ئەساسە کە ئەوان خۆیان کرد بە فیدایی بۆ دینی ئیسلام هەتا ئیمانیان لە جیهاندا بلاو کردەوەو یارمەتی حەزرەتیان‌دا بە هەموو جۆرێو قورئانی شەریفیان وەرگرتو بە هۆی لەبەرکردنو نووسینەوە گەیاندیان بە چینی تابیعین ، ئەوانە کە نزیکە ئیمتیباریان بکەین بە یەکەم چین بۆ خوێندنو خوێندنەوەو ئینسانی جیهان لەوانەوە فێری دەرزی دینو تەدریس بوونو عالەمیان بە عیلم ڕووناك کردەوە ، وەکو ئەبو حەنیفە نەعمانی کوڕی ثابت - رضی الله عنه - و هاوچەرخەکانی کە بوون بە (محطه)ی کارەبای عیلمو مەعریفەت بۆ عالەم لەبەر ئەوە نزیك بوون بە چەرخی خاوەنی شەریعەت حەزرەتی موحەممەد - صلی الله علیه وسلم - و ئاگادار بوون بەسەر سەبەبی هاتنەخواری ئایەتەکانی قورئانو لەسەر تەفسیرو بەیاناتی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - و لەسەر مشاوەراتو موناقەشاتی عالمانی ئەصحاب لە مەسائیلی وردو بەقیمەتداو عالم بوون بە جێگەی ئیجماعو جێگەی ئیختیلافو زۆریو کەمی دەستەی باسەکان .

وە عەلاوە لەمانە خودای تەعالا زانای کردوون بە ئەسراری عیبارەتی قورئان لە ( خاص وعام ، ومطلق ومقید ، ومحکم ومتشابه ، ومجمل ومبین ، وناسخ ومنسوخ ) . هەروا زانا بوون بە ڕەفتاری ئەهلی مەدینەی مونەووەرە ، ئەوانەیان کە زاناو هوشیارێکی بەرز بوون ،

وەکو ئیمامی مالیك ، وە زانا بوون بە جێگەی (استعمال)ی لوغـــەتی عەرەبی‌و مەقصەدو مەبەست لە موفرەدات‌و جوملەکان ، وەکو ئیـمامی شافیعی موحەممەدی کوڕی ئیدریس ئامۆزای حـــەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـو بە جیددی لەگەڵ سەنەدی حەدیثەکان هاتوچۆیان ئەکرد وەکو ئیمام ئەحمەد ( ابن حنبل ) ـ خودا لــە هەموویان ڕازی بێ ـ ئەمانە بــــە ڕاستی قورئان‌و حەدیثیان ڕووناك کردەوە بو هـــەموو ئینسانێکی موسوڵمانی هوشیارو مەعنـاو مەفهوومی ئەوانەیان دانا لـە بەر چاوی موسوڵماناندا بۆ خودا •

دەرکـــەوت مەحەبەتی ئەم ئیمامـــانە لەسەر چ ئەساسێك بوو مەحەبەتی صاڵحە بەرزەکان لەسەر ئەو ئەساسەیە ، کە ئوصوولی ئیسلام هەر چەند لەسەر ئەو یازدە ماددەیە بەیان کران ، بەڵام لە تەطبیقـات‌و عەمەلدا فەرق زۆرە لە بەینی یەکێکدا کەمێ دڵی ڕووناك بێتەوە بـــە نووری ئیمان لەگـــەڵ ئەو ئینسانەدا کە سینەو دڵی وەکو مـــەنزڵ مونەووەر بێ بە ئیمان‌و ئیخلاص‌و ڕەغبەت‌و ڕەهبەت‌و لـــە کـــاتی بەجێهێنانی ئەرکانی ئیسلامدا خاشیع‌و خائیف بێ لە نوێژداو ڕۆحی ڕوو بـکاتە تەربیەی نەفسی‌و پاك‌کردنەوە لە شەهوەتی خـــواردن‌و خواردنەوە هەتا ئەو نەفسەی بەڕاستی دامرکێ‌و ملکەچ بێ‌و ببێ بـــە نەفسی ( مطمئنة ) لە ڕۆژوو گرتندا ، وە یەکێ بە ظاهیر خۆی مـــەنع بـکا لە طەعام بەڵام بە دەم‌و زمان مەشغووڵی غەیبەت‌و بوختان‌و بە دڵ تێــکەڵی دونیای حـــەرام بێ •

جا ئەو کۆمەڵە ئەصحابە کە وا بە نووری ئیمانی کامیل مونەووەر بوون‌و بە ئادابی شەرم لە خودا موئەددەب بوون گەلێ ئینسانی پـاك لەسەر دەستیان گەیشتن بە بەهرەو ئەو بەهرەمەندی‌یە هات بۆ تابیعین‌و

لەوانەوە بۆ تابیعی تابیعینو پەرەیسەند لە عالەمی ئیسلامدا بە نـەوعێ لەسەر پەیڕەوی قورئانو حەدیث بـــە لەفزو مـــەعنا تەربیەتی نەفسی عالەمیان کرد لەسەر ڕووکردن لە خودای تەعالاو ئیعتیماد لەسەر ئەوو داواکردنی ڕەزامەندی هەتا ڕۆحی ئیمانیان خستە ناو دڵی موسوڵمانانەوە جا ڕەحمەت لەوە کە فەرموویەتی :

ئایینی ئیسلام کە یازدە بابە
لەگەڵ حوببی حەق مایەی ثەوابە
مەحەببەت لە بۆ خوداو پێغەمبەر
لە بۆ ئەصحابی حەزرەتی ئەنوەر
بۆ زانایانی ئوصوولو ئەحکام
بۆ صالحانی خاوەن ئیحتیرام
بۆهەر کەسیکیش بۆ دین بەسوود بێ
بۆ دینو دونیا ڕووی لە مەقصوود بێ
(نامی) موحیبە تا ئاخر نەفەس
بە بێ مەحەببەت کەس نەبوو بە کەس

## نووري دووەم : ئەساسی دینی ئیسلام قورئانە

بزانن ئایینی پاکی ئیسلام دامەزراوە لەسەر قورئان کـــە خـودا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەســـەر ئەم بەیاناتە کـــە دێت :

قورئان ئەفەرموێت ئیمان باوەڕکردنە بە خوداو بە مەلائیکەتەکانو بە پێغەمبەرانو بـەو کیتابانە خـودا ناردوونی بۆ پێغەمبەرانو بە ڕۆژی

قیامەتو بە قەزاو قەدەر ، وە قورئان ئەڵێ : ئەرکانی ئیسلام نوێژەو ڕۆژووەو زەکاتەو حەججەو ئیقرار بە خودایەتی خوداو بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ٠

قورئان دەستوورە بۆ هـــەموو ئەحکامی ئەمرو نەهیو ڕەوایی و ناڕەوایی ، بۆ هـــەموو هوشیـاریێ مەعنای وایە لە هەموو بیروباوەڕو کردەوەیەکدا پێویستە تەماشای ئیطاعەی قورئانی پیرۆز بکەین ٠ قورئان ئەفەرموێت : ( اطیعوا الله واطیعوا الرسول وأولی الأمر منکم ) واتـــە : فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەرو خاوەن فەرمانی خۆتان بکەن ، واتـــە خاوەن فەرمانی موسوڵمان ، خواه مەبەس لە فەرمانڕەواکان سەرۆکانی دونیایی موسوڵمان بێ یا سەرۆکانی زانیاریو ئیجتیهاد بێ ٠ قورئـــان ئەفەرموێت بە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ : ئێمە قورئانمان ڕەوانە کردووە بۆ لای تۆ بۆ ئەوە کە تۆ بیگەیێنی بە هوشیارانی عالــــەمو ڕووناکی بکەیتەوە بۆیانو تۆ فەرمانڕەوای بەیانی ئایاتی قورئانیت ٠

قورئان ستایشی ئەصحابەکانی پێغەمبەر ئەکاو بـــە پیرۆزو بـــە حورمەتو بە خاوەن شەرافەتو عیزەتیان دائەنێ ، لەسەر ئەم بەیاناتە:

یەکـــەم بە خیطاب لەگـــەڵ یاران ئەفەرموێت : کنتم خیر أمـــــة أخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهون عن المنـــکم وتؤمنون بالله ) واتە ئێوە هەر لە ئەزەلدا لە عیلمو زانیاری خۆمدا باشترینی ئوممـــەتو کۆمەڵەیێ بوون کە دروست کراون بۆ پێغەمبەرەکانی جیهانو حاڵتـــان وایە کـــە ئەمر ئەکەن بە چاکەو نەهی ئەکەن لە خـــرابەو ئیمـــانو باوەڕتان هەیە بە زاتی خودای تەعالا پەروەردگاری تاقو تەنیـــاو زاناو تەوانا ، خاوەن خواستو خواهیشو شنەواو بیناو گۆیا لەگەڵ عالەمدا ٠ وە ئەم خیطابە بە نرخە هەرچەند بە یاسای (اصول الفقه) هەموو ئوممەتی

پێغەمبەر دائەگرێ بەڵام بە دەرەجەی یەکەم لەگەڵ ئەصحابەو یارانی پێغەمبەردا قسە ئەکـــا ۰

وە قورئان ئەفەرموێت : ( محمد رسول الله والذين معـــه أشدّاء على الكفار رحماء بينهم تراهم ركّعـــا سجّدا يبتغون فضلا مـــن الله ورضوانا سيماهم في وجـوههم مـــن أثر السجود ) ، ئەمـــە ستایشی ئەصحابەیە بە گشتی ۰

وە قورئان لە شەئنی ئەصحابی ( بيعة الرضوان )دا ئەفەرموێت : ( ان الذين يبايعـــونك انّما يبايعون الله يـــد الله فوق أيديهم ) ۰ وە فەرموویەتی : ( لقد رضي الله عن المؤمنين اذ يبايعونك تحت الشجرة فعلم ما في قلوبهم فانزل عليهم السكينة وأثابهم فتحا قريبا ) ۰ واتە : بـــە ڕاستی خودا ڕازی‌یە لەو خاوەن ئیمانانە لەو کاتەدا عەهدیان لەگـــەڵ تۆدا کرد لە ژێر داری ( بيعـــة الرضوان )دا خـــودا زانایە بەوەی والە دڵیاندا لە ئیمانو ئارامیو نووری ڕەحمەتی نارده خوارەوە بۆ ســـــەر دڵیانو جـــەزای دانەوە بە فەتحێـــکی نزیك کە فەتحی شاری مەککەی موکەڕەمەیە ۰

وە قورئان لـــە شـــەئنی پێش‌کەوتوانی هیجرەتو نەصرەتدا فەرموویەتی : ( والسابقون الأوّلون من المهاجرين والأنصار والـــذين اتّبعوهم باحسان رضي الله عنهم ورضوا عنه وأعدّ لهم جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها ذلك الفوز العظيم ) ۰ واتە : ئەوانـــەی کـــە پێش‌کەوتنو لـــە ئەووەڵەوە بوون لە موهاجیرەکـــان بۆ مەدینـــەی مونەووەرەو یارمەتی دەرەکان بۆ دامەزراندنی دینی ئیسلامو ئەوانەیش کـــە پەیڕەوی ئەوانیان کرد لە خزمەتدا بە ساغی لەگـــەڵ خـــوداو پێغەمبەرو موسوڵمانانەدا خودا ڕازی بووە لەوانو داوای ئەوە ئەکـــا

ئەوانیش ڕازی بن لەو ، وە ئامادەی کردووە بۆیان ئەو باغاتی بەهەشتە کە جۆبارەکان لە ژێری دارەکانیانەوە ئەڕۆن حاڵی ئەمانە وەهایە ئەمێننەوە لەو باغاتەدا هەتا هەتایە ، وە ئەمە گەیشتنە بە پایەی خاوەن مایەی گەورە •

وە قورئان ستایشی ئەبوبەکری صیددیق ئەکا لە کاتێکدا لەگەڵ حەزرەتدا لە ئەشکەوتێ مەشهووردا خۆیان پەنا دابوو کافرەکان هاتن بۆیان‌و ترسا لەوە کافرەکان پێیان بزانن ، حەزرەت ـ صلی الله علیە وسلم ـ بۆ دڵدانەوەی فەرمووی : دڵ زویر مەبە خودا والە گەڵمان • جا خودا رزگاری کردن •

**یەکێ دووەم بێ لە بۆ پێغەمبەر**
**ڕەفیق بێ لە بۆ ڕەهبەری ئەنوەر**
**خودایان لەگەڵ بێ بە مایەی ڕەحمەت**
**چلۆن نابێتە سەرداری ئوممەت**
**عەطای خودایە پایەی دارایی**
**یارمەتی حەققە پایەی پاشایی**

وە قورئان ستایشی ئەصحابە موجاهیدەکانی بەدرو ئوحـودو حونەین ئەکاو پایەی فیداکاری ئەوان دەر ئەبڕێ • ئوممەتێ ئەوەندە خاوەن هیممەت بن پێویستی هەموو ئینسانێکی پاکی بە غیرەتە حقووقی مەحەبەت‌و کەرامەت‌و خزمەتیان ڕابگرێ‌و باوەڕی وابێ ئەوانە هەموو دەست‌و قۆلی حەزرەت بوون لـە دامەزراندنی دینی ئیسلامدا لـە خۆرهەلات‌و خۆرنشین‌و باکورو باشوردا • ئەمە کردەوەی گشتی‌یە بۆ ئەوان ، ئەمجار تەماشای بەرهەمی یەکە یەکەی زاتە گەورەکانیان بکەن•

مەعلوومتانە کـە حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ لـە نەخۆشی وەفاتیدا ئەبوبەکری صیددیقی کرد بە ئیمـــام بۆ ئەصحابەکـان ، وە ئیمامەت لە حەیاتی حەزرەتدا وەزیفەی خۆی بوو ، وە مادام حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەبوبەکری کرد بە ئیمام بۆ عام مەعنـای وایە جێگە داری حەزرەتە ، لـە لایێ ترەوە خودا فەرموویەتی لە مەدحی ڕیجالی دینی ئیسلامدا : ( وامرهم شوری بینهم ) • وەکو مەعلوومتانە لە پاش موناقەشەو مودانەشە ئەبوبەکری صیددیق بوو بە خەلیفـــەو جێـــگەدارو تا ئیستە نـــە بینراوەو نە بیستراوە کـــەس مونکیری ئیستیحقاقی ئەبوبەکر بوو بێ ، وە ئەگەر حەزرەتی عەلی بەنەصص‌و ئەمری حەزرەت نامزەد بووایی بۆ خەلافەت بێ‌شوبهە عالـەم دژمن بووایێ عەلی خەلافەتی خۆی دەر ئەبڕیو داوای ئەکردو بەرابەو بـــە نەص مەجالی تەقیە نیە ( مع انّه ) حەزرەتی عەلی وەکو باقی ئەصحابەکان بەیعەتیان کرد ئەویش بەیعەتی کردو فەرمانی ئەبوبەکری گرتە گەردنی خۆیو تەصەڕوفاتی ئەبوبەکری پەسەند کرد ، حەتتا لـــە تەقسیـمی غەنائیمی یەمامەدا جاریەی لە ئەبوبەکر وەرگرتو بوو بە ( ام الولد )و موحەممەدی لێ بوو کـــە مەشهوورە بە موحەممەدی حەنەفی‌یە بـە ئیعتیباری دایـکی کە لە قەبیلەی بەنی حەنیفە بوو ، وە لەسەر تەفاهومو مەحەبەت ئەیامی لەگەڵ ئەبوبەکردا ڕابوارد •

وە ئەبوبەکر لە زەمانی خەلافەتیا کـە دوو ساڵو دە مانگ بـوو ـ تەقریبەن ـ هەر ئەورەو هەرایێ لە قەبائیلی عەرەبدا بوو ، خـــامۆشی کردو هەمووی ڕام کردنو جەنـگی کرد لەگـــەڵ موســـەیلەمەی کەذذابداو کوشتیو سوپاکەی بڵاو کردەوە بە وڵاتدا ، یا هاتنەوە ژێر فەرمـــان •

وه لـه ترسی مردن‌و کوژرانی ئـه‌و ئه‌صحابانه کـه قورئانیان له‌به‌ربوو به ئیجماعی ئه‌هلی عیلمی ئه‌صحابه‌و ڕای عومـه‌ری کوڕی خه‌ططاب به کیتابه‌تی زه‌یدی کوڕی ثابیت کاتبی وه‌حیی ، هه‌موو قورئانی پیرۆزی گرد کرده‌وه‌و له‌ســه‌ر پێستی حه‌یوان نووسیانه‌وه‌و قورئانی پاراست لـه فـه‌وتان .

وه له ناساغی وه‌فاتیدا عه‌هد نامه‌ی نووسی بۆ عومه‌ری خه‌ططاب‌و عومه‌ر بوو به خه‌لیفه‌ی دووه‌م‌و ده‌ستی کرد به ڕێک‌خستنی کاروباری ئیسلام ، ئه‌و ئیصلاح‌و ته‌نظیماته ئه‌و کردی که‌س نه‌یکرد .

ولاتی جه‌زیره‌ی عه‌ره‌بی پاك کرده‌وه‌و شاماتی گرت‌و فـه‌تحی عیراقی کردو ئێرانی پاك کرده‌وه ، ئه‌مــه له خۆرهه‌لاته‌وه ، وه لــه خۆرنشینه‌وه میصری گرت ، خولاصه مولکی ئیسلامی زۆر گـه‌وره کردو گه‌لێ ئیصلاحاتی وای کرد ده‌لاله‌ت ئه‌که‌ن له‌ســه‌ر قـایه‌ی پیرو باوه‌ڕی .

ئه‌وه‌نده‌یش به‌ینی خۆش بوو له‌گه‌ڵ حه‌زره‌تی عه‌لیدا عـه‌لی ( ام کلثوم )ی کچی خۆی بۆ ماره بڕی ، که ئه‌مه مه‌عنای هێزی مه‌حه‌به‌ته .

وه له‌و کاته‌دا که عومه‌ر به ده‌ستی ( ابو لؤلؤ )ی مه‌جووسی شه‌هید کرا به‌ر له وه‌فات‌کردنی خه‌لافه‌تی کرد به ڕاوێژ له به‌ینی عه‌لی‌و عوسمان‌و باقی عه‌شه‌ره‌ی موبه‌شه‌ره‌و هه‌موویان عوسمانیـان ئیختیـار کرد ، وه ئیمامی عه‌لی به قه‌طعی ناڕه‌زایی ده‌ر نه‌بڕی‌و عوسمان بوو به خه‌لیفـه‌ی حه‌زره‌ت ــ صلی الله علیه وسلم ــ وه به عه‌لاوه‌ی خزمه‌ته‌کانی زه‌مانی پێشووی گه‌لێ خزمه‌تی کرد به عاله‌می ئیسلام‌و ئیسلامی خسته پێش چاوی عاله‌م ، ئه‌گه‌ر ئینصاف بێ ئه‌و جه‌معی قورئانه که ئه‌و کردی بۆ ئه‌وه که

قیرائەتی جیا جیا نەبێ لە قورئانداو موسوڵمانان نەچن بە گژ یەکتردا ، لوجنەیەکی دروست کردو حەزرەتی عەلی کرد بە موشریف بە سەریانەوە تا هەموو قورئانی مەوجوودیان گرد کردەوە ، وە لەسەر زمانو لەهجەی قورەیش حەوت نوسخە قورئانی نووسیەوەو ڕەوانەی کردن بە وڵاتەکاندا ، بۆ کووفەو بۆ شامو بۆ مەدینەی مونەووەرەو بۆ مەککەو بۆ میصرو بۆ یەمەنو بۆ بەحرەین • وە عالەمی ئیسلامی ڕزگار کرد لە ئیختیلاف •

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەتی عەلی فەرموویەتی : ئەگەر من گەورەی ئیسلام بوومایە لە پێش هەموو کارێکدا ئەم جەمعی قورئانەم ئەکرد •

وە پاش شەهادەتی عوسمان ـ رضي الله عنه ـ بەیعەتیان بە حەزرەتی عەلی کردو دامەزرا •

مەبەست ئەمەیە ئەم زاتانە هەموو خزمەتی وایان هەیە کەس ناتوانێ ئینکاری بکا ، مەبەس ئەمەیە واجبە لەسەر موسوڵمانان لەسەر ڕووناکی قورئانو بە هۆی یارمەتی بیرکردنەوە لە حەقیقەت ، ئیمانو باوەڕیان بێ بەوە کە ئەصحابە = یارانی حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ هەموو شایستەی مەدحو ئەناو ستایشن ، وە جومهوری موسوڵمانان لەسەر ئەو بیروباوەڕەن کە گەورەترینی ئینسانی موسوڵمان لە پاش وەفاتی حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەبوبەکری صیدیقە جا عومەری کوڕی خەططاب ، جا عوسمانی ( ذي النورين ) جا عەلی کوڕی ئەبو طالیبە ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ •

وە لەسەر ڕووناکی مەعنای قورئانی پیرۆز ئەصحابەی پێغەمبەر

ـ صلى الله عليه وسلم ـ به شێوەی گشتی چاکترینی ئوممەتی ســەر عەرزن‌و هەر کەسێ موسوڵمان بێ واجبە لەسەری کە باوەڕی وابــێ ئەصحابە ئەهلی عەداڵەتن‌و موبارەکن ، وە هەر کەسێ موخالیفی ئــەم بیروباوەڕە بێ باوەڕت وابێ لە کۆمەڵی ئیسلام بەدەرە •

**یارانی حەزرەت بۆ ڕۆژگاران**
**حسێب کراون لە فیداکاران**
**ئەبارێ بە سەر ڕۆحی ئەواندا**
**بارانی ڕەحمەت بە وێنەی باران**
**خوێنی ئەوان بوو بۆ باغی ئیسلام**
**ڕژا بە وێنەی ئاوی جۆباران**
**بەرهەمی ئەوان گەیشت بە عالەم**
**بوو بە ڕووناکی دڵی دڵداران**

وە لە مەوزووعی ئیسباتی گەورەیی ئەصحابەکاندا ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ گەلێ حەدیثی بەرز سابت بووە کە ئەبن بە دەلیل لەســەر بەرزی ئەو زاتانە • وە بۆ ڕووناکی دڵتان بازێ لەو فەرموودە بــەرزە بەڕێزانەتان بۆ ئەنووسم :

یەکەم ڕیوایەت کراوە لە ( عمران بن حصين )ەوە ـ خــودای لێ ڕازی بێ ـ کە حەزرەت ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : ( خير أمتي قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم ) واتــە چــاکترین ئوممەتی من ئەهلی چەرخی منە ، لە پاشان ئەوانە کە (مباشرة) بــە شوێنی ئەواندا دێن‌و لە پاشان ئەوانە کە بە شوێنی ئەواندا دێن •

ئەم فەرموودەیە بوخاری لە کیتابی (الرقاق)دا ڕیوایەتی کردووە•

دووەم ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵلاوە ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ لە حەزرەتەوە ـ صلى الله عليه وسلم ـ کە فەرموویەتی : ( خير الناس قرني ثـم الذين يلونهم ثـم الذين يلونهـم ثم يجيء قوم تسبق شهادة أحدهم يمينه ويمينه شهادته ) ٠

مەعنای (تسبق) تا ئاخر ئەمەیە کە : ئەو قەومە پەلەپەل ئەکەن بۆ شەهادەتدان لە پێش ئەوەدا کـە داوای شەهادەتیان لێ بکرێو پەلــە ئەکەن بۆ سوێند خواردن لە پێش ئەوەدا کە داوایان لێ بـکرێ ٠ وە مەبەست ئەوەیە کە ئەو قەومە دینیان کزە ٠

ئەم حەدیثە شێخی بوخاری لە ( رقاق )داو موسلیم لە بابي فەضلی صەحابەدا ڕیوایەتی کردووە ٠

ئــەم دوو حەدیثە شەریفە بە ڕووناکی ئیسباتی پایەی هــەموو ئەصحابی پێغەمبـەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەکەن ، هــەروا دەلاڵەت ئەکەن لەسەر شەرەفی قەرنی دووەمو سێیەم ٠

سێیەم ڕیوایەت کراوە لە ( أبو سعيد الخدري ) ەوە ـ رضي الله عنه ـ ئەفەرموێت : حەزرەت ـ صلى الله عليــه وسلم ـ فەرمووی : ( يأتي على الناس زمان فيغزو فئام من الناس ، فيقولون : فيــكم مــن صاحب رسول الله ؟ فيقولون : نعم ٠ فيفتح لهم بــه ثم يأتي على الناس زمان فيغزو فئام من الناس ، فيقال : هل فيكم من صاحب أصحاب رسول الله ؟ فيقولون : نعم ٠ فيفتح لهم به ٠ رواه الشيخان ، أخرجه البخـاري في كتاب الجهاد ، باب من استعان بالضعفاء ٠ ومسلم في الفضائل ) ٠

ئەم حەدیثە شەریفەیش دەلیلە لەسەر گەورەیی یارانی حەزرەت ـ صلى الله عليه وسلم ـو ئەهلی قەرنی تابیعینیش ، وە دەلیلە لەســەر

پیرۆزی بازێ شەخص‌و سوودی ئەو پیرۆزی‌یەش بۆ غەیری خۆی .

چوارەم ڕیوایەت کراوە لە جابیرەوە کە حەزرەت ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ فەرموویەتی : ( لا تمس النار مسلما رآني او رأى مـن رآني ) واتە : ئاگری دۆزەخ نالـکی بە پێستی موسوڵمانێکەوە کـە منی بینیبێ ، یا کەسێ کەمنی بینیبێ . ئەمەیش هەر دەلیلە بۆ شـەرەفی ئەهلی دوو قەرن = قەرنی ئەصحابەو تابیعین .

پێنجەم ڕیوایەت کراوە لە (برید)ەوە ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ کە حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : ( ما من أحد من أصحابي يموت بأرض الا بعث قائدا ونورا لهم يوم القيامـة . رواه الترمذي في السنن . رقم الحديث/٣٩٤٩) .

ئـەم فەرموودەیشە بەڕاستی ئیسباتی پایەی بـەرزی یارانی حـەزرەت ئەکـا .

شەشەم ڕیوایەت کراوە لە ئەنەس ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ کـە حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتـی : ( ان الله لا يجمـع أمتي ـ أو قال : أمة محمد ـ صلی الله علیه وسلم ـ علی الضلالة وید الله مع الجماعة ) و ریوایەت کراوە بەلەفظی : لا يجمع الله أمتي عـلى ضلالة ) وە لە ڕیوایەتێکی تردا : ( لا تجتمع أمتي على ضلالة ) وە بە لەفظێ تر : ( انّ أمتي لا تجتمع على ضلالة . رواه ابن ماجه . رقـم الحديث /٣٩٥٠ ) .

حەوتەم ڕیوایەت کراوە لـە ( الدار قطني )ەوە : ( أصحابي كالنجوم بأيّهم اقتديتم اهتديتم ) واتە : یارانی مـن وەکو ئەستێـرەی ئاسمانن تابیعی هەر کامیان بین شارەزای ڕێگەی ڕاست ئەبین .

هەشتەم ڕیوایەت کراوە لە ( عبدالله بن مغفل ـ رضی الله عنه ـ کە حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووبەتی : ( الله الله من أصحابي لا تتخذوهم غرضا بعدی فمن أحبهم فبحبي أحبهم ، ومن أبغضهم فببغضي أبغضهم ، ومن آذاهم فقد آذاني ، ومن آذاني فقد آذى الله ومن آذى الله فيوشك أن يأخذه ) ٠

ئەم فەرموودە پیرۆزە ئیسباتی شەرەفی هەموو ئەصحابە ئەکا ٠ ( رواه الترمذي في سننه ٠ رقم الحديث / ٣٩٥٤ ) ٠

ئەمانە عەلاوەی ئەو حەدیثانەن کە وارید بوون لە مەناقیبی عەشەرەی موبەششەرەو مەناقیبی یەکە یەکەی خولەفای راشیدین ، بە تایبەتیو بە خصووصی ٠ وە گەلێ حەدیثی شەریف وارید بوون لە ئیسباتی شەرەفیان کە ئیستە ئیجاب بە ڕیوایەتیان ناکا لەبەر درێژی مەوزووعەکە ٠

جا ئینسانی موسوڵمان ئەگەر تەماشای دەلیلی نەقلی ئەکا با تەماشای ئەو ئایەتانەو ئەو ئەحادیثە بکا ٠

وە ئەگەر تەماشای دەلیلی نەقلی ناکا با بە عەقڵ بڕوانێ بزانی کێ بوون لە چەرخی یەکەمدا جیهادیان کردو دینی ئیسلامیان وەرگرتو دوو جار بەشێکیان چوون بۆ وڵاتی حەبەشستانو بۆ جاری ئاخر هاتنەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە ٠ با بیر بکاتەوە بزانێ کێ بوو غەیری ئەصحابی کیرام کە قورئانیان نووسیەوەو لەبەریان کردو بوون بە مەصدەری گەیاندنی قورئانی پیرۆز بە عالەمداو کێ بوون ئەوانە کە وڵاتی ( جزیرة العرب )و شامو فەلەسطینو میصرو ئەو شوێنانی موجاوەرەیان فەتح کرد ، تا باش تێبگات کە ئەصحابی حەزرەت ئەشرەفی ئوممەتی

حەزرەتن ـ صلی الله علیه وسلم ـو خودای تەعالا تەزکیەی کردوونو حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ تەئکیدی ئـەو تەزکیەی کردووە ( بناء علیه ) ئەبێ ئێمە بە دڵو زمـان بڵێین : ( اللهم صل علی سیدنا محمد وآله وصحبه اجمعین ، وعلی اتباعه باحسان الی یوم الدین وسلم تسلیمـا ) •

## بەشی چوارەم لە مەحەببەتو خۆشەویستی

مەحەببەتو خۆشەویستی ئینسانی موسوڵمانـە بۆ ئەو زانایانە کـە پایەداربوون لەسەر بڵاوکردنەوەی یاسای ئیسـلامی پـیرۆز بە قەڵـەمو زمان بە خامەو نامەو بە دڵ تێکۆشان بۆ گردکردنەوەی ئەحـکامو فەرمانەکانی ئیسلامو نەشری قورئانو ڕەفتار بە قورئانو نەشـری فەرموودەکانو ڕەفتاری حەزرەتی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ •

ئەمانە بە کورتی زانایانی دینی ئیسلامنو عیبارەتن لە (قراء) ئەوانە قورئانیان وەرگرتو ضەبطی قیرائەتەکەیان کردوەلە (محدثین) ئەوانـە حەدیثەکانی حەزرەتیان نووسییەوەو لەبەریان کردو فەرقی دەرەجاتو پایەی حەدیثەکانیان داناو جێگەی ڕەفتاریان دیاری کرد لـە ئەحکامی ئوصوولی دینو فرووعی دینو لە مەناقیبو فەضائیلی ئەشخاصدا • وە ئەوانە کە بە هێزی نووری عیلمو دین ئیجتیهادیان کردو ( استنباط )ی ئەحکامیان کرد بۆ بیروباوەڕو کردەوەی موسوڵمانانو جەمعو تەدوینی ئەحکامو دەلیلیان کردو کردیان بە زەخیرە بۆ موسوڵمانان کە لەسەری دەوام بـکەن هـەتا هـەتایە •

ئـەم کۆمـەڵە ئینسانە خاوەن ئیحسانانە ناودارو پایەداری دینی

ئیسلام‌و واجبی ذیممه‌ی موسوڵمانه ئیحتیرامیان بگرێ‌و دۆعایان بۆ بکاو به ئیمام‌و پێشه‌وایان دا بنێ بۆ عاله‌می ئیسلام ، خـــواه لـــه ئیعتیقاداتدا ، وه‌کو ئیمامی ( ابو الحسن الأشعری )و ( ابو منصـور الماتریدي ) وه‌یا لـه هێنانی قورئان وه‌کو حه‌وت قاریئه‌کان‌و ڕاوی‌یه‌کانیان یا لـه ئه‌حکامی شه‌رع‌و دیندا ، که ئه‌مانه ژماره‌یان له صه‌دری ئه‌ووه‌ڵدا زۆر بووه ، به تایبه‌تی ئه‌وانه‌یان که مه‌ذهه‌به‌کانیان نووسراوه‌ته‌وه‌و بـه صافی گه‌یشتووه به عاله‌می ئیسلام ، وه‌کو : ئیمام ئه‌بو حه‌نیفه = نه‌عمان کوڕی ثابیتی کووفه‌یی‌و ئیمام مالیك کوڕی ئه‌نه‌س لـــه مه‌دینـــه‌ی مونه‌ووه‌ره‌داو ئیمامی شافیعی موحه‌مه‌ده‌دی کوڕی ئیدریس له مه‌دینـه‌و به‌غداو میصردا ، وه‌کو ئیمامی ئه‌حمه‌د بنو حه‌نبه‌لی شه‌یبانی له به‌غدادا - خودایان لێ ڕازی بێ - •

وه دلیل له‌سه‌ر صیححه‌تی ئه‌حواڵی ئه‌مانه کیتاب‌و سوننـــه‌ت‌و ئیجماعه له پێش ده‌رکه‌وتنی ئیختیلافدا • جا ده‌لیل له‌سه‌ر صیححه‌تی ئیجتیهادی زانایان له قورئاندا چه‌ند ئایه‌ته :

یه‌که‌م ئایه‌تی : ( واذا جاءهم أمر من الأمن أو الخوف أذاعوا بـه ولو ردوه الى الرسول والى أولی الأمر منهم لعلمه الذین یستنبطونه منهم) واته : کاتێ بـگاته لای ئه‌وان کارێ له بابه‌تی ئاسایشی یا ترســـه‌وه بڵاویان ئه‌کرده‌وه به ناو خه‌ڵـکداو ئه‌گه‌ر پرسیاریان بـکردایه لـــه پێغه‌مبه‌ری خودا - صلی الله علیه وسلم - یا له خاوه‌ن بیروڕاکان لـــه حه‌قیقه‌تی ئه‌و کارانه‌یان ئه‌زانی ، ئه‌وانه‌یان که هێزی ده‌رهێنانی مه‌غزی کاروباری جیهانیان هـه‌یه • ئه‌م ئایه‌ته به ڕووناکی ئیسباتی ئه‌وه ئه‌کـا که له ناو کۆمه‌ڵدا بازه زانیارێ هه‌ن کـــه ئه‌توانن ئه‌سراری کـــار ده‌ربخه‌ن • ئه‌مه‌ش ئیجتیهادو (استنباط )ی ئه‌حکامی دینیش ئه‌گرێته‌وه•

دووەم فەرموودەی خودا : ( وما كان المؤمنون لينفروا كافة فلولا نفر من كل فرقة منهم طائفة ليتفقهوا في الدين ولينذروا قومهم اذا رجعوا اليهم لعلهم يحذرون ) واتە : ئەوە بۆچی لە هەموو کۆمەڵێکی گەورە تاقمێ جیا نابنەوە بۆ ئەوە فامی ئەحکامی شەرع بکەن و بگەن بە پایەی ئیفادەو تەمێی ئادەمیزاد هەتا قەومەکەیان بترسێنن لە عیقابی خودا بەڵکو دوور بکەونەوە لە کاری نالایق •

مەعنای وایە پێویستە لە هەموو کۆمەڵێکدا بازە کەسێ خۆیان ئازاد بکەن بۆ ئەوە بگەن بە پایەی فامی ئەحکامی دین و ئیستیخراجی دەقایق بۆ ئەوە بتوانن تەربیەی ئوممەت بکەن ؛ چونکە (تفقه) لە (فقه) وەرگیراوە ، وە (فقه) عیبارەتە لە زانستی ئەحکامی شەرعی عەمەلی بە هۆی دەلیلەوە •

سێیەم فەرموودەی خودا : ( فاسألوا اهل الذكر ان كنتم لا تعلمون) واتە : پرسیار بکەن لە خاوەن زانیاری‌یەکان ئەگەر خۆتان مەقصەد نازانن • ئەم ئایەتە دەلیلە لەسەر ئەوە واجبە ئینسانی نەزان پرسیار بکا لە زانا لە سەرەتای زانیاریدا هەتا ئەگا بە پایەی زانیاری ڕەسای تەواو •

چوارەم فەرموودەی خودا : ( ومن يشاقق الرسول من بعد ما تبين له الهدى ويتبع غير سبيل المؤمنين نوله ما تولى ونصله جهنم وساءت مصيرا ) واتە : هەر کەسێ موخالەفەی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ بکا پاش ئەوە کە دەرکەوت ڕێگەی ڕاست چۆنەو بکەوێتە شوێنی غەیری ڕێگەی موسوڵمانان ئەوە هەڵی‌ئەسووڕێنین بۆ ئەو جیهەتە نابارە کە ئەیەوێ ڕووی تێ‌بکا ، وە ئەیهاوینە ناو دۆزەخەوەو زۆر خراب ئەبێ لە جیهەتی ئەنجام و ماوای قیامەتەوە •

بە ظاهیری ئەم ئایەتە واجبە پەیڕەوی کردن بە حەزرەت

ـ صلى الله عليه وسلم ـو قبووڵكردنى ڕێگەى موسوڵمانان له شوێنى ئیجماع‌و ئیتیفاقدا ، وه به ئاشكرا دیاره ئیتیفاقى زانایانى موسوڵمان هەیه لەسەر ئەوه كه لە شوێنێكدا (نص) نەبێ لەسەر حوكمى شەرعى ئەبێ به ئیجتیهاد حوكم دەربێت‌و پەیڕەوى ئەو ئیجتیهادە واجبە ، چونكى له صەدرى ئیسلامەوه ئیجتیهادله بەینى زانایانى دیندا بەكار هاتووه حەتا له زەمانى حەزرەتیشدا كاتێ ئەصحابە دوور بووبن بۆ ئەحكامى دین ئیجتیهادیان كردووه .

وه دەلیل له سونەتى حەزرەتدا ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەسەر دروستى ئیجتیهاد زۆره ، لەوانەیه ئەوەى كه ئەبو داوودو ترمزى‌و دارەمى له ( معاذ بن جبل ـ رضي الله عنه ) كاتێ كه حەزرەت ـ صلى الله عليه وسلم مەعاذى كوڕى جەبەلى نارد بۆ وڵاتى یەمەن : ( قال له : كيف تقضي ؟ قال : أقضي بكتاب الله . قال : فأن لم تجد ؟ قال : فبسنة رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ قال : فان لم تجد في سنة رسول الله ولا في كتاب الله ؟ قال : أجتهد برأيي ولا الو . أي : ولا أقصر ) .

ئەم حەدیثە هەرچەند كە بازێ كەس موعارەضەى سەنەدەكەیان كردووه ، بەڵام ( ابن القيم الحنبلي ) له كتێبى ( اعلام الموقعين )دا ئەڵێ : ڕەفیقەكانى مەعاذى كوڕى جەبەل ئینسانى بلوەڕ پێ‌كراون‌و ئەو كەسەى ئەم حەدیثەى نەقل كردووه ناوى حەرث كوڕى عەمره ، ئەم حەدیثەى نەقل كردووه له كۆمەڵێ له ڕەفیقانى مەعاذ ـ رضى الله عنه ـ نەك له یەكێكەوه . وه حەدیثەكە ئەگەر یەكێكیش لەوان نەقلى بكا كافى‌یه چ جاى ئەوه كه له ژمارەیەكى موناسبەوه نەقل كراوه . وه ( ابن القيم ) هەروا ئەفەرموێت : شوعبه ئەم حەدیثەى ڕیوایەت

کردووه • وه بازێ له ئیمامانی حەدیث ئەڵێن : کاتێ لـــه ئیسنادی حەدیثدا شوعبەتان دەس کەوت بیگرن‌و بەری مەدەن ؛ چونـــکی لـــه پیـــاوه خـــاوەن قیمەتەکانە •

وه له ( تقریب الراوی )دا سیوطی ئەڵێ : ئەم حەدیثه له جوملەی ئەحادیثی صیحاحه •

وه لەو حەدیثانەیه ئەوەی کـــه موسلیم‌و بوخاری‌و ئەبو داوودو ترمزی‌و نەسائی‌و ئیبنوماجه ڕیوایەتیان کردووه له ( عبدالله بن عمرو بن العاص )ەوه له ئەبو هورەیرەوه ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : ( اذا حکم الحاکم فاجتهد فاصاب فله اجران ، واذا حکم فاجتهد فأخطأ فله اجر واحد ) واته : کاتێ حاکم حوکم بـــکا لەسەر ئیجتیهادو بـــکا بە حەق ئەوه دوو ئەجـــری هـــەیەو ئەگـــەر حوکم بـــکا لەسەر ئیجتیهادو به هەڵەدا بڕوا یەك ئەجری هەیە•

وه ئـــەم ئیجتیهادەیش بۆ کەسێ ئەبێ جامیع بێ بۆ ئەســـبابی ئیجتیهاد ، بەم جۆره عالم بێ به قەواعیدی عەرەبییەو به ئوصولی فیقـــەو به ئایات‌و ئەحادیثی ئەحکام‌و به یاسای قیاس‌و ئەقسامەکانی • وه لەگەڵ ئەمانەدا عالم بێ به مەسائیلی ئیجماع‌و ئیختیلاف‌و به صیفاتی ( ادلـــة ) له تەواتورو صیححەت‌و حوسن‌و غەیری ئەمانه • وه دارای صیفـــەتی عەداڵەت بێ • وه مادام گەیشته ئەم پایه دروسته ئیجتیهاد بـــکا ، وه ئەو ئیجتیهادەی له کاتێ غەیری ئەو موجتەهید نەبێ فەرزی عەینـــه ، وه ئەگەرنا فەرزی کیفایەیه •

وه دەلیله لەسەر وجووبی ئیجتیهاد ئایەتی ( فاتقوا الله ما استطعتم) چونـــکه ئیجتیهاد لـــه ئەسبابی تەقواو پارێزگاری‌و ئیطاعـــەی ذاتی خـــودایه •

# واجبه لەسەر غەیرە موجتەهید تەقلیدی موجتەهید بکا

ئینسانێ موسوڵمان بێ پێویستە لەسەر بەصیرەت‌و چاو ڕووناکی بڕوا ، خودا فەرموویەتی بە حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ : (قل هذه سبیلی ادعو الی الله علی بصیرة انا ومن اتبعني ) لەسەر ئەم ئایەتە پیرۆزە واجبە لە هەر حوکمێکدا وارد ببێ مادام ئینسان خۆی دەلیل نەزانێ تابیعی عالمێ ببێ کە زانابێ بە حوکمەکەی ؟ چونکی عالم‌و جاهیل‌و زاناو نەزان وەکو یەك نین ( قل هل یستوی الذین یعلمون والّذین لا یعلمون ) ٠

وە دەرکردنی حوکم لە ئایەت‌و حەدیث پێویستە بە زانستی ئایات‌و ئەحادیث بە ئەسبابی ( التعارض والترجیح ) بە فەرق لە بەینی عام‌و خاص‌و موطڵەق‌و موقەیەدو ناسخ‌و مەنسووخ‌و غەیری ئەمانەیش ٠ مادام ئینسان دارای ئەو عیلمە نەبوو وە لە خۆیەوە حوکم بکا ئەوە بە تابیعی هەواو ئارەزوو ئەژمێررێ ، خودای تەعالا فەرموویەتی : ( فاسألوا اهل الذکر ان کنتم لا تعلمون ) حەتتا ئەگەر کابرا بازێ عیلمی بۆ حاصڵ‌بوو بوو ئەوە هەر واجبە تابیعی عالمێکی پێ‌گەیشتۆ بێ ( وفوق کل ذی علم علیم ) ٠

ما دام بەو دەلیلانە لە کیتاب‌و سوننەتدا بەیان کران ئیجتیهادکردن حەق بوو ، ئەو کەسە تابیعی ئیجتیهاد نەبێ‌و ئیجتیهاد بە حەق نەزانێ ئەوە گومڕایەو ئەبێ بە هۆی گومڕاکردنی موسوڵمانانیش ، حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : ( ان الله لا یقبض العلم انتزاعاً ینتزعه من صدور العباد ولکن یقبضه بموت العلماء فاذا لم یبق عالما اتخذ

الناس رؤوسا جهالا فسئلوا فافتوا بغير علم فضلوا وأضلوا ) ـ ئــەم حەدیثە لە ( جامع الصغیر )دایەو ڕەمزی صیححەتی لەسەرە • وە مادام ئیجتیهاد حەق بوو هەر موسوڵمانێ بە حوکمی ئیجتیهادێ بڵێ : ئــەوە بیدعەتە ، ئەوە خۆی خاوەن بیدعەتە ؟ چونــکی ئیجتیهاد لەسەر ئایەت‌و سونتەتەو ئیهمالی شتێ موافیقی کیتاب‌و سوننەت بێ بیدعەتە •

وە هەر موسوڵمانێ کەمێ شعووری دینی بێ ئەزانێ کە ئیجتیهاد واجبە بێ لەبەر ئەوە دینی ئیسلام دینێکە دەوام ئەکا تا ڕۆژی قیامەت‌و چــەند وەزعی عەجیب بەسەر ئوممەتەکەیدا دێ ، وە ئایات‌و ئەحادیثی ئەحکامیش بــە ظاهــیر بە بــێ ( استنباط‌و قیاس‌و استدلال ) رەســایی ناکــا بۆ هەموو ئــەو حوکمانە ، کــە وابێ ناچــار ئەبێ خــاوەن علم ئیجتیهاد بــکا • وە ئەگــەر بە ئیجتیهاد ڕەفتــار نەکرێ ئەحــکام وەرناگیرێن‌و موسوڵمانان ئەکەونە سەر فەوزاو هەوەس‌کاری • وە شتی وا لە ئیسلامــدا نیــە •

## نووري ئیجماع

ئیجماع لــە عورفی دیندا بریتی‌یە لە : ئیتتیفاقی موجتەهیــدانی دینی ئیسلام لەسەر حوکمێکی شەرعی • جا هەر کاتێ ئەمانە بە ئیتتیفاق قەراری حوکمێکی وایان دا ئــەوە ئەو حوکمــە حەققــەو پێویستە ئیطاعــەی بــکەین •

وە ئیسباتی ئیجماع بە کیتاب‌و سوننەتە یەکەم ئەو ئایەتە کــــە خوێندمانەوە : ( ومن یشاقق الرسول من بعد ما تبین له الهدی ویتبع غیر سبیل المؤمنین نولّه ما تولی ونصله جهنم ) خودای تەعالا تەهدیدی

ئەو کەسانەی کردووە کە لا ئەدەن لە ڕێگەی گشتی ئەهلی ئیمان .

دووەم ئەنەسی کوڕی مالیك ڕیوایەتی کردووە لـە حەزرەتەوە - صلی الله علیه وسلم - فەرموویەتی : ( ان الله لا یجمع أمتی - أو قال : - أمة محمد - صلی الله علیه وسلم - علی ضلالة ، وید الله مع الجماعـــة ) .

سێیەم حەزرەت - صلی الله علیه وسلم - فەرموویەتی : (ما رآه المسلمون حسنا فهو عند الله حسن ) .

عەلاوە لەســـەر ئەمە ئیجماع دائەمـــەزرێ لـــە گردەوەبوونی موجتەهیدەکان لەسەر یەك حوکمی شەرعي .

وە ئەو موجتەهیدانە یەکە یەکە مادام دروست بێ ڕەفتار بکرێ بە بیروڕایان ئەوە کە گردەوە بوونو ڕەفتارت نەکرد لازم دێ دەلیلی ضەعیف ڕەفتاری پێ بکرێو دەلیلی بە قووەت ڕەفتاری پێ نەکرێ ، وە ئەگەر ڕەفتاری پێ بکرێو هێزی هەر وەکو قسەی یەکە یەکە بێ ، لازم دی ضەعیفو قەویی وەکو یەك بن ، کە وابێ ئەبێ کە ئیعتیـــار کرا موجیبی عیلم بێ ، واتە موجیبی ئیعتیقادی بێ کە لەوە زیاتر لـــە طاقەتدا نەبێ ، ( بناء علیه ) دەلیلی موسوڵمان لـــە دینی ئیسلامـــدا : قورئانەو حەدیثەو ئیجتیهادی موجتەهیدی طاقەو ئیجماعی موجتەهیدان.

جا بزانن : ئەو عالمانە کە بە پایەی ئیجتیهاد گەیشتوون زۆر بوون، بەڵام بازێ لەوان خـــودا یارمەتی داون بۆ ئـــەوە کـــە بیروباوەڕیان بنووسنو بڵاو بینەوە بـــە ناو موسوڵماندا ، وەکو شێخ ( ابو الحسن الأشـــعری والشـــیخ ابو منصور الماتریدی ) لە ئوصـــوولی دینو ئیعتیقادیاتدا ، وە ئیمـــامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی مالیكو ئیمامی شـــافیعیو

ئیمامی ئەحمەد بنو حەنبەل‌و داوودی ظـــاهیری لە فرووعیاتدا • وە ئەمانە مەذهەبیان نووسراوەتەوەو تەدریس کراون‌و لەســەر یاســای ئوصوول‌و قەواعیدی ( تخريج واستنباط )یان تەقریر کراوەو بە دەرز خوێنراون‌و موناقەشە کراوە ( بناء عليه ) هەر ئەو مەذهەبانە کـــە وا تەدوین کراون دروستە ڕەفتاریان پێ بکرێ ؛ چونکە یاساو ئوصووڵی موجتەهیدەکان دیارن • وە ئەوانە کە مەذهەبیان نە نووسراوە ڕەفتاریان پێ ناکرێ ، یەکــەم مەذهەبەکەیان لە لای ئێمە موحەققەق نیە • دووەم یاسای ئوصوولی ئەو ئیمامانە دیار نین‌و نازانین لە (استدلال)دا فیـکری ئەو زانایە چـــۆن بووە •

وە ئەو کەسانە ئەیانەوێ لە خۆیانەوە بە بێ ئیجتیهاد لەســەر ظاهیری کیتاب‌و سوننەت بڕۆن ئەیانەوێ لە باتی چوار ئیمام هـــەزار ئیمامی بێ‌سوود دابنێن ، وەیا ئەیانەوێ بە بێ دەلیل بە ئارەزووی نەفس موسوڵمانان گومڕابکەن •

## نووري فەرق لە بەینی سوننەت‌و بیدعەتدا

بەر لە هەموو شتێ پێویستە دوو حەدیثی شەریف لەم مەوزووعەدا ڕیوایەت بکەین بۆتان هەتا لەسەر ڕووناکی مەعنای ئەوانە بــگەین بە مەبەستی خۆمـــان •

یەکەم ئەو فەرموودە پیرۆزە ڕیوایەت کراوە : ( عن أبي نجيح العرباض بن سارية ـ رضى الله عنه ـ قال : وعظنا رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ موعظة وجلت منها القلوب وذرفت منها العيون ، فقلنـا : يارسول الله كأنّها موعظة مودّع فاوصنا • قال أُوصيـــكم بتقـــوى الله

- عزوجل - والسمع والطاعة ، وان تأمر عليكم عبدٌ فانّه مــــن يعش منكم فسيرى اختلافا كثيرا ، فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشـــدين المهديين ، عضوا عليها بالنواجز ، واياكم ومحدثات الأمور ، فان كـــل بدعة ضلالة • رواه أبو داود والترمذي ، وقال : حديث حسن صحيح) •

لـــەم فەرموودەدا حەزرەت - صلى الله عليه وسلم - نەهیی‌و تەحذیری ئەصحابەی فەرمووە لـــەو یاسانە کـــە دروست ئەکرێن‌و فەرموویەتی بە عوموومی : هەرچی بیدعەت بێ گومڕاهی‌یە ، واتە باوەڕ پێ‌کردن بە جێهێنانی ئەبێ بە هۆی ونکردنی ڕێگەی دینی ئیسلام •

دووەم فەرموودەیەکە وەکو شەرح‌و بەیان وایە بۆ ئەم حەدیثـــە شەریفە ، ئەوەیش ئـــەو حەدیثەیە کە ڕیوایەت کراوە لە ( ام المؤمنين عائشة - رضي الله عنها - قالت : قال رسول الله - صلى الله علەوسلم- من احدث في امرنا هذا ما ليس منه فهو ردٌ • رواه البخـاري ومسلم ) واتە هەر کەس دروست بىکا لەم دینی ئێمەداو لەم یاســـای کیتاب‌و حەدیثەدا کارێ کە لەو دینە نەبێ ئەوە مەردوودەو بەتاڵە •

زانایانی دین بەیانی ئەو شتە کـــە لە دین نەبێ وەهـــا کردووە فەرموویانە : وەکو شتێ کـــە لـــە زاتی موخـــالیفی ئیسلام بێ‌و هیچ قاعیدەیەکی دین ڕەوای نەدابێ ، وەکو نەذری ڕاوەستان لەبەر هەتاودا ، یا کارێـــکی دین کە شرووطی نەیێتە جێگە ، وەکو نوێژ بە بێ دەس‌نوێژ، یا بە بێ ڕووکردن لە قیبلە بە بێ ناچاری ، یا کارێـــکی وا بێ بە هۆی نوقصانی فەرزێ لە فەرزەکانی نوێژ ، وەکو نوێژێ کە ڕکاتێکی لێ کەم بکرێتەوە ، یا ڕۆژووی مانـــگی ڕەمەزان لەگەڵ تەرکی ڕۆژێ لـــە ئەووەڵەوە یا لە ئاخریەوە ، یا زیادکردن لە واجبات وەکو زیادکردنی ڕکاتێ لە یەکێ لە نوێژەکاندا یا چەند ڕۆژێ لەسەر مانـــگی ڕەمەزان

( والحاصل ) شتێ زیاد کرابێ لەسەر دین ، یا کەم کرابێ بە نەوعێ کە ئەصلێکی نەبێ لە دینی ئیسلامدا ـ نەك وەکو کورتەوەکردنی نوێژی چوارڕکاتی لە سەفەردا یا گردەوەکردنی دوو نوێژ ـ ئەوە ئەو شـتـە بیـدعەتە •

وە ڕوونا‌ك‌کردنەوەی ئەم مەوزووعە بە تەواوی ئەمەیە کە دەلیلی دینی ئیسلام : قورئانەو حەدیثەو ئیجماعی ئوممەتو ئیجتیهاد • وەکـو بەیان کران •

وە ئەلفاظی قورئانی پیرۆزو حـەدیثی شەریف چوار نەوعـە دەلالەتیان هەیە کە مەشهوورن بە : ( عبارة النص ، واشـارة النص ، ودلالة النص ، واقتضاء النص ) بە عەلاوەی مەعنای مەجازیو کینـایە لـە کـەلامدا •

جا ( عبارة النص ) عیبارەتە لەوە دەلالەتی لەفظەکان لەسـەر مەعنای مەقصوود ، وەکو دەلالەتی ( قل هو الله أحد الله الصمد لم یلد ولم یولد ولم یکن له کفواً احـد ) تۆ بڵێ واقیع ئـەوەیە زاتی خـودای تەعالا یەکـەو خودا مەرجیعو پەنا بۆبراوە، منداڵی نەبووەو لە کەسیش نەبووەو کەس هاو وێنەی ئەو نیە •

وە ( اشارة النص ) دەلالەتە لەسەر مەعنایەکی ڕاستی واقیعی وا کە دەلالەت لەسەری مەقصوود نەبێ ، وەکو دەلالەتی ئایەتی : (أحلّ لکم لیلة الصیام الرفث الی نسائکم ) واتە : ڕەواداره بۆ ئێوە لە شـەوی ڕۆژووی ڕەمەزاندا چوونەلای ژنەکانتان • کە ئەم ئایەتە بـە ئیشـارە دەلالەت ئەکا لەسەر ئەوە کەسێ لە ڕەمەزاندا ڕۆژی لێ بووەوە بـــە جەنابەتەوە ئەوە ڕۆژووەکەی دروستە چونـکی مادام هەموو ئەجـزای

شەو جێگەی نووستن بێ لەگەڵ ژندا ئەگەر کەسێ لـە پێش بانـــگی سبەینێ بە چەند دەقیقەیەك ڕۆیشتە لای ژنەکەی ناتوانێ بێتە قەراغەوەو هـەر لـە شەودا خۆی بشۆرێ •

وە ( دلالة النص ) وەکو دەلالەتی ئەلفاظ لەسەر مەعنـــایێ وا مەقصوود بێو موساوی مەعنای لەفظ بێ یا بەرزتر بێ لەو ، وەکـــو دەلالەتی ئایەتی : ( ولا تقل لهما أف ) لەسەر ئەوە کە حەرامە لێیـــان بدەن ، یا سەریان بشکێنن ، یاخود قسەی بێشەرمیان لەگەڵدا بکرێ •

وە ( اقتضاء النص ) وەکو دەلالەتی ئەلفاظی نەص لەسەر مەعنایێ کە بە بێ ڕیعایەتی ئەوە مەعنای ئایەتەکە ڕاست نەبێ ، یا حوکمەکـەی ڕاست نەبێ ، وەکو دەلالەتی : ( واسأل القرية ) لەســـەر مەعنـــای : ( واسأل أهل القرية ) جا لەسەر ئەم تەقریرە ئەگەر حوکمێ دروست‌کرا لە عالەمی ئیسلامداو لە ئەلفاظی قورئانو حەدیث بە هیچ دەلالەتێ لەم چوار دەلالەتە مەفهووم نەبووو خاریج بوو لە ئیجماعی زانایانی دین ، هـەروا لـە ئیجتیهادی یەکێ لە موجتەهیدەکانی دەر نەچووبوو بـــە شێوەی ( استصحاب ) یا ( استحسان ) یا مەصالیحی مورسەلە ، وە یـا بە حەقیقەت ، یا بەکینایەو مەجاز مەدلوول نەبوو بۆ ئایەتێ یا حەدیثێ ئەتوانین بڵێین : ئەو کارە بیدعەتەو گومراهی‌یە •

بەڵام ئەگـەر شتێك پەیدا کرا لە ئیسلامدا کە ( أدلـّە )ی شەرع شەهادەت بدا لەسەری وەکو ئەوە شوێنێ دروست بکەیت بۆ میوانخانە، وەیا بۆ شوێنی خوێندنی علوومی دین ، یا بۆ شوێنی ذیکری خودا ، یا بۆ نەخۆشخانە ، یا بۆ تەمێو تەربیەی ئینسانی نەزانو بێئاگاه لـــە واجبات ، یاخود کۆمەڵێ ئینسانی موسوڵمان ئامادە بکەیتو بیان‌بەی بۆ دروست‌کردنی خانوو بۆ بازێ هەتیوی داماو ، یاخود کەسێ شـــەرحی

ئەحادیثی شەریفە بکا ، یا تەفسیری قورئانی پیرۆز بکا ، ئەمانە هەموو بەر قەواعیدی عاممەی ئیسلام ئەکەون .

ئێمە تەماشا ئەکەین صەدری ئەووەڵ کە کۆمەڵی خولەفاو پێشینانی ئوممەت لە پاش وەفاتی حەزرەت - صلی الله علیه وسلم - دوو جار قورئانی پیرۆزیان گرد کردەوە ، جارێ بۆ پاراستنی نەفسی قورئانو جارێ بۆ پارازتنی لەهجەو قیرائەتەکەی . وە فەرموودەکانی حەزرەتیان نووسی‌یەوەو ئیعرابو سەرو بۆریان بۆ قورئانی پیرۆزکرد . هەروا عیلمی نەحوو صەرفو مەنطیقو بەلاغە = مەعانیو بەیانو حەقیقەتو مەجازو تەشبیەو کینایەو ئیستیعارەیان داناو گەلێ علوومی بەسوود بۆ عالەمی ئیسلام . هەروا میجرابیان بۆ مزگەوت دروست کردو بینای منارەو قوبەیان دامەزراند ، هەروا لە عالەمی ئیسلامدا تەدریبی سوپای ئیسلام دامەزرا ، وە عومەری کوڕی خەططاب - رضي الله عنه - دەفتەری بۆ ئەفرادی سوپای ئیسلام دروست کرد ، وە عومەرو عوسمانیش پاش وەفاتی ئەو لە پێش بانگی جومعەی ناو مزگەوت ئەمریان کرد بە بانگ‌دان بۆ ئیخباری خەڵك . وە گەلێ شتی تر لەوانە کە دامەزراون لە وڵاتی ئیسلامدا ، وەکو صڵاوات دان لەسەر حەزرەت - صلی الله علیه وسلم - لە پاش . بانگەکان خوێندنی قورئان لەسەر مەحفەلەکان لە ڕۆژی جومعەدا . وە خوێندنەوەی مەولوودنامەو میعراجنامەو تەسبیحات لە پاش نوێژەکانو حەلقەی ذیکرو تەهلیلەو مەجالیسی وەعظو ئیرشادو خوێندنی قورئان لە مەجلیسی تەعزیەدا ، یاخود قورئان خوێندنو ئیهدای ئەوابەکەی بۆ ڕوحی یەکێ یا جەمعێ لە مردووان . ئەمانە هەموو دەلیلیان هەیەو ئیستیفادە ئەکرێ لە ئایاتو ئەحادیثی شەریفە . وە یاخود لەسەر یاسای مەصالیح لە

ئیسلامدا ئەمانە بە قەطعی ڕەوا نیە بە بیدعەت حسێب بکرێن ؛ چونکی ئەم شتانە خاریج نین لە دین‌و ضددی قەواعیدو ئوصوولی ئیسلام نین ، بەڵکو گەلێ ڕووناکن لەبەر چاوی موسوڵماندا حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : ( علیکم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدین )وە فەرموویەتی : ( ما رآه المسلمون حسنا فهو عند الله حسن )وە خـودا فەرموویەتی : ( ومـن تطوع خیـرا فان الله شـاکر علیم )وە فەرموویەتی : ( وما تقدموا لأنفسکم من خیر تجدوه عند الله هو خیـرا واعظم أجرا ) وە ( ان شاء الله ) لە مەولا لە فەصڵێکی موناسبدا باسیان ئەکـەین‌و ئیسباتی ئەوە ئەکەین کـە داخڵی یاسـای ئیسلامن‌و مەشـروعن •

# نووري بەیانی ئەهلی تەصەووف‌و ئەهلی طەریقەت

ئەو کەسە کە قورئانی پیرۆز بخوێنێتەوەو بە فیکرێکی تیژ بڕوانێ بۆ دینی ئیسلام باش حاڵی ئەبێ کـە دین عیبـارەتە لـە پەیوەندی‌و عەلاقەیەکی ڕاست لەگەڵ پەروەردگاری عالەمدا مەشغووڵ بوونـە بـە ذیکرو طاعەت‌و پاك‌کردنەوەی نەفس لە صیفاتی ناهەموار ، بۆ ئـەوە بتوانێ عیبادەتی خالیص لە هەوا بکا بۆ خودای تەعالا • وە لـە گـەلێ ئایەتدا ئەم مەوزووعە بەیان کراوەو مەنعی غەفلەت لە ئینسانی کامیـل کراوە • خودا فەرموویەتی : ( قد افلح من زکیها وقد خاب من دسّیها ) واتە : بەراستی ڕزگاربووەو ئەبێ ئەو کەسەی کە نەفسی خـۆی پاك کردووەتەوە لە ڕەذائیل ، وە مەحرووم‌و بێ‌هرە بووە لە پیرۆزی کەسێ کە وانەفسی خۆی بە پیسی هێشتبێتەوە وەفەرموویەتی : (قد افلح من تزکی

وذكر اسم ربه فصلى ) وه فەرمووپەتی بە حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ ( ولاتكن من الغافلين ) وه فەرمووپەتی : ( ولا تطرد الـــذين يدعون ربّهم بالغداة والعشيّ يريدون وجهه ) وه فەرمووپەتی : ( ولا تطع من اغفلنا قلبه عن ذكرنا واتبــع هـــواه وكان أمـــره فرطا ) وه فەرمووپەتی : ( والذين جاهدو فينا لنهدينهم سبلنا وان الله لمع المحسنين ) وه فەرمووپەتی : ( يا ايها الذين آمنوا اتقو الله وكونوا مع الصادقين ) وه فەرمووپەتی : ( وما أمروا الاّ ليعبدوا الله مخلصين لـــه الدين ) وه فەرمووپەتی : ( يختص برحمته من يشاء ) ٠

وه لەبەر ئەوه کــه ئوممەتی پێغەمبەر ـ صلی الله علیــه وسلم ـ چاکترین ئوممەتو ئەصحابەکانی حەزرەت باشتر ئینسان بوون لــــه جیهاندا ٠ چـــەند کەسێ لە ئەصحابەکان لە عەهدی حەزرەتدا نەفسی خۆیان مەشغووڵ کرد بە زیادە تەقواو طاعەتەوە لەسەر ئەساسی پەیڕەوی کیتابو سوننەتو خودایش بە فەضلی خۆی دڵی ئەوانەی نوورانی کرد بە نەوعێ بوو بە ئاوێنە بۆ دڵی حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ وه لەو ئەنوارو بەرەکاتە لە قەلبی موبارەکی ئەودا بوونو بەشدار بوونو ئیمانیان تەرەققی کرد بە نەوعێ بوون بە چرای تەنویر بۆ گــەلێ لــه ڕەفیقان ٠ وه بەتایبەتی ئەبوبەکری صیددیقو ئیمامی عەلی کوڕی ئــەبو طالیب لەم بابەتەوە پێش کەوتن ، هەتا سەلمانی فارسی لـــه ئەبوبەکری صیددیقەوەو قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکو لە سەلمانەوەو جەعفەری صادیق لە قاسمەوە مونەووەر بوون ، هـــەروا حـــەسەنی بەصری لە حەزرەتی عەلیو حەبیبی عەجەمی لـــه حەسەنو داوودی طائی لە حەبیبەوەو مەعرووفی کەرخی لە حەبیبەوەو ( سري سقطی ) لە مەعرووفو ئیمام جونەید لە سەرییەوە دڵیان نوورانی بووه ٠ وه

ئاداب‌و یاسای ئەوانە پەیڕەوی قورئان‌و حەدیث‌و دەوامی طاعەت‌و ذیکرو عیبادەت بوو •

وە هەر کام لەو زاتانە ئادابێکی تایبەتی‌یان بوو لە عیبادەت‌و طاعەت‌و تەصفیەی دڵدا ، ناو ئەبرا بە طەریقەت ، واتە : ڕێگەی فلان کەس لە عیبادەتدا •

وە ئەم زاتانە لە ئەوەڵەوە لە قەڕنی یەکەمدا بوون ، جا تایبەکانیان کەوتە قەڕنی دووەم‌و قەڕنی سێیەم کە لە لایەنی حەزرەتەوە ـ صلی الله علیه وسلم ـ شەهادەت دراوە بەوانە کە ئەوانە باشترین ئەهلی قەڕنەکانن •

وە ئەم زاتانە هەموو ئەهلی قورئان‌و حەدیث‌و فیقهی ئیسلام بوون‌و هەموو ئەهلی عالەمی ئیسلام تەبەڕوکیان ئەکرد بە وەزعی ئەوان‌و شەهادەتیان ئەدا بە باشی بیروباوەڕو ئەحواڵ‌و ئەخلاقیان‌و ثبووتی ئیمتیازی ئەوانە بووە جێگەی ئیجماعی عولەماو زانایانی عالەمی ئیسلام • وە لە عەینی حاڵدا بە واسیطەی دەوامی ذیکرو طاعەتەوە گەلێ کەرامات‌و ئاثاری جوانیان لێ دەرکەوت بە نەوعێ کە هەموو هوشیارێ بزانێ ئەوانە لە خالیصەو صەفوەی عیبادی خودا بوون‌و ئەو کەراماتانە ڕاست بوون‌و ئەو ئاثارە کە لەوانەوە دەرکەوتووە لەباتی حورمەت‌و ڕێزگرتنیان بووە لە لای خوداوە ، وەکو خودای تەعالا لە قورئاندا باسی کەرامەتی مەریەمی عەذراو ( اصحاب الكهف واصحاب الرقيم )و ڕەفیقی حەزرەتی سولەیمان ـ علیه السلام ـ ئەکاو لە سورەی (جاثية)دا خودا فەرموویەتی : ( أم حسب الذين اجترحوا السيئات ان نجعلهم كالذين آمنوا وعملوا الصالحات سواء محياهم ومماتهم ساء ما يحكمون ) • بە هەر حاڵ ئەو عەبدانە کە وا بە ئیخلاص عیبادەتی خودایان بەجێ بێنن

بــه دەوام وەکو بارانی بەهار ئەنوار بەسەر دڵیاندا ئەڕژێو گــەلێ کردەوەی خاریقیان لێ دەرئەکەوێ •

وە فەرقی ئەو کەرامەتانە لەگەڵ موعجیزەدا ئەوەیە کــــە ئەم ئەولیایانە داوای (نبوة)و ریسالەت ناکەنو پەیرەوی خۆیان دەر ئەبڕن بە ذاتی پێغەمبەر ـ علیه الصلاة والسلام ـ •

وە ئــەو زاتانە بوون بــە هۆی بڵاوکردنەوەی دینی ئیسلامو دامەزراندنی دین لە دڵی موسوڵمانانداو موسوڵمان گەلێ ئیستیفادەیان کرد لێیان ، واتە عولەمای شەریعەت ئەحکامی دینیان ڕووناك ئەکردەوە بۆ ئوممەتی ئیسلامو ئەولیاکانی زەمانەیش بە فەیضی بەرەکات تەنویری دڵی موسوڵمانانیان ئەکرد بە نەوعێ شوبهە لە دڵیاندا نەدەما •

وە خودای تەعــالا بۆ دەربڕینی پایەی ئەو زاتانە فەرموویەتی : ( الا ان أولياء الله لا خوف عليهم ولا هم يحزنون)وە فەرموویەتی : (ان الذين قالوا ربّنا الله ثم استقاموا تتنزل عليهم الملائكة الاّ تخافوا ولا تحزنوا وابشروا بالجنة التى كنتم توعدون نحن اولياؤكم في الحيــاة الدنيا وفي الآخرة ولكم فيها ماتشتهي أنفسكم ولكم فيها ما تدّعون ) وە فەرموویەتی: ( واتقوا الله ويعلمكم الله ) وە لە حەدیثی قودسیدا وارید بووە ، وەکــو ئیمــامی نەوەوی لــە حــەدیثی سیو هەشتدا ڕیوایــەتی کردووە : ( قال رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ انّ الله تعالى قال من عادى لي وليا فقد أذنته بالحرب ، وما تقرّب اليّ عبدى بشيء أحبّ اليّ ممــا افترضته عليه ، ولا يزال يتقرب اليّ بالنوافل حتى أحبّه فاذا احببته كنت سمعه الذى يسمع به وبصره الذي يبصر به ويده التي يبطش بها ورجله التي يمشي بهــا ، ولئن سألني لأعطينّه ولئن استعاذ بي لأعيذنّه • رواه البخــارى ) •

وە ئادابی ئەهلی تەصەووف ئیشتیغالە بە طاعەتو نەوافیـــل وەکو عەینی حەدیثە قودسی‌یەکە ، وە بەسە بۆ دەلیل لەسەر صیححەتی ئەعمالی ئەهلی تەصەووف وجوودی ئەهلی ذیکرو ئەصحابی (صُفَّة) لە عەهدی حەزرەتدا ـ صلی الله علیه وسلم ـ کە جارجار زۆرو جارجار کـــەم بوون • وە مەشغوولّ بوون بە تەقواو طاعەت • وە حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ مەنعی نەکردوون ، بەڵـکو بە نەظەری ڕەحمەت تەماشـای کردوون •

وە ئەو کەسانە کە ئەهلی تەصەووف نیشانی موسوڵمانان ئـەدەن وەکو ڕەهبانانی مەسیحیو ئایەتی : ( ورهبانية ابتدعوها ما كتبناها عليهم الا ابتغاء رضوان الله فما رعوها حق رعايتها وكثير منهم فاسقون ) ئەکا بە دەلیل بۆ خۆی ، گەلێ بێ‌ئینصافەو بەیانەکەی دوورە لە عیلمو عەقڵو زانیاری بە چەند دەلیل :

یەکەم بە ظاهیری ئایەتەکە لەسەر ئیبتیداعی ڕەهبانییەت هـاتووە ، واتە ڕەهبانییەت دروست کراوەو لە دینەکـــەیان نــە بووە ، بەڵام تەصەووف لە دینی ئیسلامدا لەسەر ئیعتباری نیهایەتی خشووعو ئەدەبەو بە جێهێنانی ئاداب بە صوورەتی شەرعی لەگەڵ دەوامی ئیتیباعی کیتـابو سونەتدا • وە ئەو ذیکرو فیکرو تەهلیلو تەوحیدە کە عادەتە لە ناویاندا هەمووی سونەتی ئیسلامە • وە ئایاتی ذیکرکردنو باسی ئەهلی ذیـــکر لە قورئاندا بە تەنیاو لەگەڵ کۆمەڵدا ، واتە بە فەردی ، یا لەگەڵ تەعاونو یارمــەتی ، گـــەلێ زۆرن •

دووەم ڕەهبانییەت عیبارەت بووە لە ژن نەهێنانو دوورکەوتنەوە لە عائیلە ، بەڵام ئەهلی تەصـــەووف گەورەیان یا ئەتباعیان نەمانبیستووە قصووریان کردبێ لە ژنهێنانو حەدیثی :

( تناكحوا تناسلوا فانني أباهي بكم الأمم ولو بالسقط ) دەستووریان بووە •

سێیەم ئەو ئایەتە پیرۆزە دەلالەت ئەکا لەسەر ئەوە خودا عالەمی ڕەهبانانی خۆش نەویستووە : چونکی ڕیعایەتی یاساکەیان نەکردووە بە حەقیقی ڕیعایەت ، واتە ئەگەر ڕیعایەتیان بکردایە هەر چەند ئەصڵەکەی بیدعەت بووە ، بەڵام ئەبووە بیدعەتی حەسەنە ، بە دەلیلی ئاخری ئایەتەکە کە ئەڵێ : ( وکثیر منهم فاسقون ) یانی : ( قلیل منهم صادقون ) کە ئەوانەن ڕیعایەتیان کردووە • بە هەرحاڵ حەیفە کەرامەتی ( اهل الله )و پیاوانی خودا بشکێنرێ بە بازێ خەیاڵاتی بێ ئەصڵ و ئەساس • وە پێویستە لەسەر ظاهیری ئایەت و حەدیث بڕواو ئیحتیرامی هەموویان بگرێ و ئەو بیروباوەڕی موسوڵمانانە لە زەمانی سابیقەوە تا ئەمڕۆ •

## مەحەببەتی زاتی خودای تەعالا

لەمەو پێش وتمان ئیمان : تەصدیق و تەسلیمە ، وە تەسلیم عیبارەتە لە ( انقیاد واطاعة )و ڕەزاو مەحەببەت بۆ خوداو پێغەمبەرو هەرچی پەیوەندی زۆر بێ بە پێغەمبەرەوەو بە هۆی خزمەتی دینی ئیسلامەوە ، وە ئەوانەیش عیبارەتن لە ئەهلوبەیتی حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ و ئەصحابەکانی و ئیمامانی موجتەهیدی دینی ئیسلام و ئەو صاڵحانە کە تێکۆشیون لە ڕێگەی دیندا هەر کەس بەقەدەر ئەندازەی خۆی •

مەحەببەتی خودا بریتییە لەوە باوەڕت بێ بەوە کە هەیەو مەوجوودەو ئەزەلی و ئەبەدی و تەنیایەو موحتاج و نیازمەند نیە بە کەس و

لەکەس ناچێو وێنەی نیەو هەرچی صیفەتی کەماڵە هەیە بۆیو دوورە لە صیفاتی نەقص • وە لە کاری خۆیدا موختارەو هەر شتێ خواستی لەسەر بێ ئەبێو هەرچی خواستی لەسەر نەبێ نابێ • وە کارەکـانی هەموو لەسەر حیکمەتنو لە هەموو میهرەبانێ میهرەبانترە • هـەر کـەس خودا یارمەتی بدا بە هیدایەتو شارەزاکردنی بۆ ڕێـگەی پیرۆزی ، ئەزانێ خۆیو غەیری خۆی لە ئادەمیزادو باقی گیانلەبەرانو دارو گیـاو کانەکانو دەریاو دەشتو کۆسارو ئاسمانو ئەستێرەکان ، ئەمانە لـە زاتی خۆیاندا ڕامن بۆ هێزی خوداو ملکەچی تەصەڕوفـاتی پەروەردگـارن •

ئەم جیهانە جوانە بێخاوەن نابێو واجبە خاوەنەکەی زینـدوو زاناو تەواناو خـاوەن خواستو خواهش بێ ؟ چونـکە لـە نەبوونەوە شت لـە خۆیەوە نابێ بە بوونەوەر • وە ئەساسی بوونی ئەم عالەمەیش واجبە کەسێ بێ خاوەن دەستەڵاتو کامیل بێ لە هەموو کارێـکدا ، ئەوەیش هـەر زاتی خودایە •

وە مەحەبەتی خوا بەمە ئەبێ یارمەتی دینەکەی بدەیو بە هەموو جۆرێ حەز بـکەی بەوە کـە ئەهلی جیهان ڕوویان لە فەرمانبەرداری ئەو بێو پەیڕەوی پێغەمبەری خودا بـکەن لە هەموو کارێکدا ، وەکو خودای تەعالا فەرموویەتی :

( قل ان کنتم تحبّون الله فاتّبعوني یحببکم الله ) •

کـە وابێ نیشانەی مەحەبەتی خودا ئیطاعەی شـەرعو دینی پێغەمبەری خودایە • جا هەر کەس لەسەر ئەم یاسا بڕوا ئەوە مەعنـای وایە مەحەبەتی خودای تەعالای هەیە •

داوا ئەکەین لە خودا ئەم صیفەتانەمان پێ بداو تەوفیقمـــان بـدا لەســـەریان •

## مەحەببەتی پێغەمبەر ـ صلی اللّٰه علیه وسلم ـ

مەحەبەت مەیلی دڵە بۆ لایَ ئەوەیَ خۆشی ئەویَ ، وە ئەمـــەیش گەلیَ نەوعی هــــەیە •

وە لە مەحەببەتی پێغەمبەرە ـ صلی الله علیه وسلم ـ باوەڕت بیَ کــە ئەو زاتە خاوەنپایە پێغەمبەری خودایەو خودا هەڵیبژاردووە بۆ ئەوە بیَ بە چرای ڕووناککەرەوەی ڕێــگەی موسوڵمانو هــــەمیشە حورمەتی بـگریَو بە گەورەی بزانیَو زۆر صلاواتی لیَبدا ، بە تایبەتی کاتیَ کــە ناوی ئەبیسی ، وە پەیڕەوی بـکا لە عیادەتو طاعــــەتی خوداداو ئەمرەکانی بە جیَ بێنیَو نەهیی لە هەرچی کردووە نەیـــکاو تێکۆشی بۆ ئەوە کە ئەخلاقی خۆی بباتە سەر ئەخلاقو ڕەوشتی ئەو ، وە ئەو قورئانە کــە نازڵ بووەتە سەری خۆشیبویَو ئەو سونـــەتو یاساو ڕەفتارە کە حەزرەت لەسەریان بووە بە قەدەر تەوانا جیَبەجێیان بـکا • وە مەحەبەتی ئالو ئەهلو ئەصحـــابو یارانی ئەوی بیَ ، وە ئیمامانی دینو زانایانی شەریعەتو یاسای ئیسلامی خۆشبویَو هەمیشە خزمەتی دینەکەیَ بـکا بە قەدەر ئیمکانو مەحەبەتی قوڕای قورئانو حافیظانی حەدیثی شەریفی بیَ • ( والحاصل ) هەرچی قازانجی بیَ بۆ دین بیـکا بە قەدەر دەستەڵاتو خۆشیبویَو هەرچی موخـــالیف بي چـاری بـــکا • خــودای تەعــالا لــەم بابەتەوە فــەرموویەتی : ( قل ان کان آباؤکم وأبناؤکم واخوانکم وازواجکم وعشیرتکم وأموال

اقترفتموها وتجارة تخشون كسادها ومساكن ترضونها أحبّ اليـــكم من الله ورسوله وجهاد في سبيله فتربّصوا حتى يأتي الله بأمره والله لا يهدي القوم الفاسقين ) واته : ئەی پێغەمبەری خۆشەویست بلێ بـــەو خەڵکە ئەگـەر باوکەکانتانو کوڕەکانتانو براکانتانو هاوسەرەکانتانو هوزەکەتانو دارایی‌یەك کـــە پەیداتان کردووەو بازرگانی‌یەك کـــە ترستان هەیە لەوە زیان بکاو خانوو مەئوایێ کـــــە پێی‌ڕازین خۆشەویسترن لـە لای ئێوە لە خوداو لە پێغەمبەرو جیهاد لە ڕێـــگەی خودادا ، دەی ماتڵ بنو چاوەڕوان بن هەتا خودا فەرمانی خۆی جێ‌بەجێ ئەکا بەسەرتانداو خودا کۆمەڵی لە یاسای دین دەرچوو هیدایەت نادا •

خودا هەڕەشەی کردووە لەو کەسانە کە ئارەزووی ئەولادو ئەهلو عەشرەتو دارایی ئەدەن بەسەر مەحەبەتی خوداو پێغەمبەرو جیهاد لـە ڕێـگەی خودادا • وە ئەمەیان حاڵی ئەکا واجبە لەسەریان مەحەبـەتی خوداو پێغەمبەر پێش بخەن لەسەر ئەم شتانە کـە خۆشەویستن لـــە دونیـــادا •

وە حەزرەت ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : ( لا يؤمن احدكم حتى اكون احب اليه من ولده ووالده والناس اجمعين ) واتە : کەس لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێ هەتا من خۆشەویستر ئەبم لەلای ئـەو لە کوڕو باوکو باقی ئادەمی‌زاد هەموویان •

وە فەرمووی بەو کەسەیش کە عەرزی کرد : مـــن خـــوداو پێغەمبەری خودام خۆش ئەوێ : ( انت مع من احببت ) واتە : تۆ وای لەگـــەڵ ئەوانەدا کـــە خۆشت ئەوێن ، یانی بەهرەی مەحەبـــەت بۆ پێغەمبەر ئەوەیە کـە لە قیامەتدا لەگەڵ حەزرەتدا ئەبێ •

وە سڕی پێویستی ئەم مەحەبەتە ، ئەمەیە : ئەگەر ئەم ڕەهبەرە گەورە نەبوایە ئادەمیزاد لەسەر باری نەزانینو بێموبالاتی بە پەروەردگار ئەمایەوە ٠ وە ئینسان کە ڕەهبەرێکی ڕاستی نەبێ سەرگەردانە ، بۆ میثال ئادەمیزاد لە پێش ڕەوانەکردنی حەزرەتی ( محمد المصطفی )دا ـ صلی الله علیه وسلم ـ جانبی خۆرهەلاتی ئاسیا یا بتپەرست بوون ، یا ئاگرپەرست ، وە بەتایبەتی ولاتی فارسو کوردستان هەمووی ئاگرپەرست بوونو بە دەوری ئاگردا هەلئەسوڕان جارجاریشیان گمێزیان پێدا ئەکرد ٠ وە جانبی خۆرنشین بتپەرست بوون ، ئەوانیش بە دەوری بتەکاندا هەلئەپەڕین ٠ وە بە پیرۆزی هاتنی پێغەمبەرەوە ـ صلی الله علیه وسلم ـ ڕوویان کرد لە عیبادەتی خودای تاقو تەنیای زیندووی زانای تەوانای شنەواو بینا ٠ وە بە هۆی قورئانی پیرۆزەوە ڕوویان کرد لە زانیاریو ماریفەتو یاسای کۆمەلایەتیو صیلەی ڕەحمو میهرەبانی لەگەل یەکدا ٠ وە یاسای عەدالەت لە جیهاندا دامەزراو یاسای ذیکرو یادی خوداو نوێژو ڕۆژوو زەکاتو حەج بەرقەرار بووەوە گەورەو بچووکییەکی موناسبو بەسوود لە ناو ئادەمیزاددا بەرپابوو ، ( والحاصل ) ئادەمیزاد پاش وێرانی دونیا بە ستەمو نەزانی کەوتە مەیدانی عیلمو صەنعەتو طاعەتو ڕیعایەتی حقووقی فەردیو ئیجتیماعی ، وە هەتا ئەم یاسایانە بەجێ ئەهێنران عالەم لە ئاسایشندا ئەژیان ٠

ئیستە کە جیهان بەو جۆرە نیە لەبەر ئەوەیە کە ئەو یاسایە بەجێ نایەتو بێگانە سەری لە موسولمانان شێواندووە ، ئەگەرنا دینی ئیسلام هەمیشە خزمەتی زانیاریو حقووقڕاگرتنو پیشەوەریو کارکردن ئەکا ٠ بڕوانن : ئەگەر یاسای زەکاتی دارایی لە پارەو زێڕو زیوداو لە

بازرگانیـداو لـه کشت‌وکاڵو حه‌یواناندا جێ‌به‌جێ ئه‌کرێ به قـه‌طعی داماو نامێنێ • وه ئه‌گـه‌ر یاسـای عـه‌داڵه‌تی ئیسلام به‌جێ بێت هیچ که‌سێ به ده‌ردی سته‌می سته‌مکار ناتلێته‌وه‌و که‌س نامه‌ردی ناکـا له‌گه‌ڵ که‌سدا ( والحاصل ) ئه‌م دینه که حه‌زره‌تی پێغه‌مبه‌ر هێناویه‌تی مایه‌ی ئاسایشی دونیاو قیامه‌ته • جا له جه‌زای ئه‌م خزمه‌ته‌دا واجبـه ئینسان ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ی به دڵ خۆش‌بوێ •

وه له مه‌حه‌به‌ته‌ی حه‌زره‌ته ـ صلی الله علیه وسلم ـ به گـه‌وره‌ی بگرین‌و به ئه‌ده‌ب ناوی به‌ه‌ین‌و بانـگی بکه‌ین ، خودا فه‌رموویه‌تی : ( یا ایها الذین آمنوا لا ترفعوا أصواتکم فوق صوت النبيّ ولا تجهروا بالقول کجهر بعضکم لبعض أن تحبط اعمالـکم وانتم لا تشعرون ) •

واته بانگ‌کردن له حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د ـ صلی الله علیه وسلم ـ له ناو خۆتان مه‌یکه‌ن به بانگ‌کردنی بازێکتان به ناوی ڕووت ، یا بـه بێ‌ئه‌ده‌بی ، یا به ده‌نـگی به‌رزی نه‌کا کرده‌وه چاکه‌کانتان سقووط بکاو جه‌زایان نه‌مێنێ له‌حاڵێکدا ئێوه به خۆتان نه‌زانن • واته به ئه‌ده‌ب بڵێن : ( یا رسـول الله ) •

**صلاوات‌دان له حه‌زره‌ت ـ صلی الله علیه وسلم ـ**

وه لـه مه‌حه‌به‌تی حه‌زره‌ته ـ صلی الله علیه وسلم ـ صلاوات‌دان له حه‌زره‌ت ، ئه‌مما له ناو نوێژه‌کـاندا ئه‌وه یا واجبن یا سونتـه‌تی موئه‌ککه‌ده‌ن ، وه ئه‌مما له غه‌یری نوێژدا ئه‌وه له‌به‌ر ئه‌وه که له یاسای دینه‌و ئه‌ده‌بێکه‌و خودا ئه‌مری پێ کردووه‌و فه‌رموویه‌تی : ( ان اللـه وملائکته یصلّون علی النبيّ یا أیّها الـذین آمنوا صلّو علیه وسلّموا تسلیما ) واته : به‌ڕاستی خوداو مه‌لائیکه‌ته‌کانی خودا صلاوات ئـه‌ده‌ن

لەسەر پێغەمبەر ، جا ئەی کەسانێ کەوا ئیمانیان هێناوە بە خـــوداو پێغەمبەری خودا صلاوات بدەن لەسەر حەزرەتو سەلامی لێ بـکەن بە سەلام‌کردن •

کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوار ئەصحابەکان عەرزی حەزرەتیان کرد: ئێمـە ئەزانین سەلامت لێ بکەین ، بەڵام صلاوات لێـــدان چلۆنە ؟ فەرمووی : بڵێن : ( اللهم صل علی محمد وعلی آل محمد کما صلیت علی ابراهیم وعلی آل ابراهیم في العالمین انك حمید مجید ) وە چـەند ڕیوایەتی تر هـەیە لـە صلاواتدان لەسەر حەزرەت ـ صلی الله علیـــه وسلم ـو گەلێ فەرموودەی حەزرەت هەن لە بەیانی ئەجرو ثـەوابی صلاواتدا کە لە کتێبی ئەحادیثو ئەذکاردا بەیان کراون فەرموودەی حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ هەیە لەسەر ئەوە هەر کەسێ تاقـە صـــلاواتێ بدا لـە سەر حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ خودای تەعالا دە خێری بۆ ئەنووسێ • وە فەرموودەی هەیە لەسەر ئەوە هەر کەسێ لە شەوو ڕۆژی جومعەدا صلاوات بدا لە حەزرەت ـ صلی الله علیـە وسلم ـ بە ئەمری خودا مەلائیکەیێ ئەڕوا ئیخباری حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەکا کە فلان‌کەسی کوڕی فلان کەس ئەم صلاواتـەی خوێندووەو تەقدیمی تۆی کردووەو ئەویش وەڵامی ئەداتەوە •

وە گەلێ صلاواتی وا هەن بە بەراوردی ئەهلی دین قازانجیـــان زۆرە بۆ چـاری موشکیلاتی ئادەمی‌زاد لە دونیادا ، وە ئەگـەر هەر بۆ ڕەزای خودا بخوێنرێن باشترە •

## باسی صلاوات‌دان له حەزرەت له پاش بانگەکان

له زەمانی فەرمانڕەوایی مەرحووم ( صلاح الدین الایوبي )ەوە یاخود له زەمانی حکوومەته چەرکەسەکان پاش ( صلاح الدین ) کراوە بە عادەت کە (مؤذن) له پاش بانگەکان ـ غەیری نوێژی مەغریب کــە کاتی کەم‌و کورتە ـ سێ جار صلاوات لەسەر حەزرەت ـ صلی اللــه علیه وسلم ـ ئەدەن • وە بازێ کەس وتویانە : ئەمە باش نیەو بیدعەتەو زیاد کراوە له دیندا • بەلام ئەو کەسە ئەم قسەیە کردووە ، یا ئەیکا ، بە هەڵەدا ڕۆیشتووە لەبەر چەند دەلیل :

یەکەم صلاوات‌دان لەسەر حەزرەت ـ صلی الله علیــه وسلم ـ ئەمرێ پێ کراوە بە ئەمرێکی موطلەق ، واتە ئەمرەکە نە بەسراوە بــە بازێ کات‌و بازێ شوێنەوە • وە یاسای دینی ئیسلام‌و ئوصوولی فیقهی ئیسلام وایە هــەر ئەمرێ کــە موطلەق بێ لە هــەر کات‌و شوێنێکدا جێ‌بەجێ بـکرێ سوننەتەو بە بیدعەت ناژمێرری ، مەگەر بەتایبەتی لــە لایەن حەزرەتەوە نەهیی کرابێ لەو شتە ( مأموربه)یە لــە کــات‌و شوێنێــکی خاصــــدا •

وە ئیمامی نەوەوی کــە یەکێکە لە فوقەهاو موحەددیثن ئــەم فەرموودەیە فەرمووە لە کتێبی (المجموع)دا •

وە قسەی ئەو برایە لە قەبیلی ئەوەیە هەر چەند صــەدەقەو ئیطعامی طەعام سوننەتە ، ئەگەر کەسێ گردی بە عادەت هەموو ڕۆژێ چوار کەسی دانا لە شوێنێکی تایبەتیداو نان‌و چێشتی پێدان ، بلێ : ئەم ئیطعامی طەعامە بیدعەتە ؟ چونــکی بەو شێوەو حاڵە بۆ چــوار کــەس چوار کەس نەبووە لە دینی ئیسلامدا لە زەمانی حەزرەتدا ـ صلی الله

علیه وسلم ـ ، یا موسولمانێ هەموو ڕۆژێ شەش قورئانخوێن دابنێ قورئان بخوێنن و ئەویش گوێیان لێبگرێ ، کابرا بڵێ : ئەم کاره خیلافی شەرعه ؟ چونکی بەم شێوه قورئان نەخوێنراوه •

ئەمانە هەموو بێخەبەرین لە یاسای ئیسلام و لە ئەحکامی موطلەق و ئەحکامی موقەیەدە ، حەیفە ئینسان بە بێ دەلیلی شەرعی کاری خێر ڕەد بکاتەوه •

دووەم حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووێەتی : ما رآه المسلمون حسنا فهو عند الله حسن ) واته : ئەو کارە و ئەو وتارە کە خوێندەوارانی موسوڵمان بە جوانی بزانن ئەوه لە لای خودا وا جوانه •

وه ئەم صلاوات‌دانه (تقریبا) هەشت صەد ساڵە لە عالەمی ئیسلامدا لە ئەغلەب جێگەدا هەیە و مەنع نەکراوه ، تا لەم ئاخر زەمانەدا کە کاتی دوورکەوتنەوەیە لە باسی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەم مەنعه هاتووەتە ناوەوه •

جا ئەگەر ئەو صلاوات‌دانه بە شێوەی ئیجماع پێی ڕازی بوون ئەوه بوو بە ئیجماعی ئوممەت و ئیجماعی ئوممەت بۆ هەموو کاتێ ئەکرێ بە دەلیلی شەرعی لەسەر جەوازی ( مجمع علیه ) • وه ئەگەر بە ( اکثرية )ە دووبارە جوانه ؟ چونکی حەزرەت ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووێەتی : ( واذا رأيتم الاختلاف فعليكم بالسواد الأعظم ) واته : کاتێ ئیختیلافتان چاو پێکەوت بکەونە شوێنی کۆمەڵی گەوره • وه لە بازێ ڕیوایەتدا ئەفەرموێت : چونکی گورگ مەڕی لە ڕان‌تاربوو ئەخوا • وه لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەددا ـ رضي الله عنه ـ چەند ڕیوایەت لەم بابەتەوه هەیە ، یەکێکیان ئەمەیە : ( الاثنان خير من

